

# کورد

## لەنێوان بەئیسلام کردن

## و

## ئیسلام بوندا



| | |
|---|---|
| نـــــاوی کتێـــــب: | کورد لەنێوان بە ئیسلام کردن و ئیسلام بووندا |
| نوسینــــــــــی: | سەلام ناوخۆش |
| نەخــــــشەسازیی: | کۆمپیوتەری هیوا |
| خـــــــە ت: | نەوزاد کۆیی |
| بـــــــەرگ : | أمين مخلص |
| نۆرە و سـاڵی چـاپ: | دووەم ١٤٣٣ك – ٢٠١٢ز |
| تـــــــیراژ: | ١٥٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٢٤٤ ) ساڵی٢٠١١ پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com




ئەم کتێبە

پێشکەشە

بەو نووسەرانەی بە عەقڵێکی

بابەتیانە مێژوو دەنوسن و دەخوێننەوە.

سەلام

٢٠٠٣/١/١١

بەرایی

# ئیسلام و کورد

ئاشنابوونی کورد بە ئیسلام مێژوویەکی کۆنی هەیە، کورد پێش ئیسلامبوونی مێژوویەکی ئەوتۆی نییە, چونکە مێژووی کورد و فارس ئەوەندە لەیەک نزیک بوونە بە جۆرێک دەسەڵاتی ڕەها بە دەست فارس بووە، کوردیش بێ دەسەڵات بووە!!

ئەو جۆرە ژیانە-ژیانی هاوبەش – هەتا سەردەمی ساسانییەکان بەردەوام بووە، ئەمە لە ڕووی سیاسی و کەلتوری و ئایینی هەر لە خزمەت و ڕاژەی فارس دابووە، ئەو پاشکۆبوونەی کورد هۆکارێک بووە کورد لە دەرفەتێک بگەڕێ، کە لە فارسەکان ڕزگاری ببێ.

هەروەها ئایینەکانی ناوچەکە ئایینی ناوچەیی بوون، ئەو ئایینانە زیاتر ئایینی نەتەوەیی، نەک ئایینی جیهانیی بن!!! زمانی دەقەکان،نەتەوەکان، هەتا پێغەمبەرەکان نەتەوەیی بووە !!ئەم ڕاستیەش لە قورئانی پیرۆز چەندان جار ئاماژەی پێکراوە!!!وەکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ : ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ﴾، هەروەها لە سورەتی الكهف : هەموو مرۆڤێك ئازاد دەکات، لەوەی باوەڕ دێنێ، یان نە ؟؟، وەکو دەفەرموێ : ﴿فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾

خاڵێکیتر قورئانی پیرۆز لە چەندان ئایەت جەخت لە سەر نەتەوە و زمانی جودا دەکاتەوە!! ئەمەش بە بەرزی خوای گەورە دەزانێ.

هەروەکو لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ :( وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ).

ئەم سێ خاڵە (نەتەوە، زمان، باوەڕ) هۆکارێکی بەهێز بووە لە سەر جیابوونەوەی کورد لە فارس!!! هەروەها زمانی ڕەسەنی کوردی لە مزگەوت گەشە و نمای کردووە وناسنامەی نەتەوەیی و جودایی لە فارسی وەرگرتووە، ئەو زمانەش زمانی مۆرکی تایبەتی بۆ دروست بووە لە ڕووی مۆرفۆلۆژی (وشەسازی)، سینتاکس (ڕستەسازی)، سیمانتیکسەوە (واتاسازی)، لە فارسی جودا بۆوە و ناسنامەی مەلایی لە مزگەوتی کوردی وەرگرتووە, لە مزگەوت، کورد بۆتە نەتەوە یەکەمەکان، کە شرۆڤەی سێ ڕێزمان : کوردی،عەرەبی، فارسی، بکات، خەباتی زانایانی کورد جێگای شانازییە .

ئەو ڕاستیە وایکردووە زۆربەی کورد، قەبوولی ئەو ئایینە نوێیە بکات،پێیخۆش بێت، لە ژێر دەستی فارس ڕزگاری ببێ.

بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

# پێشەکی

پرس(مسألة)ی فتوحاتی ئیسلامی لە زۆربەی کتێبە مێژووییەکانی سەردەمی ئیسلامی وەك کتێبەکانی (طبری) و (خلیفة بن خیاط) و (قدامة بن جعفر) و (ابن الاثیر) و (بلازری) و (واقیدی) هتد باس کراوە.

هەروەهازۆربەی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی لە بارەی مێژووی ئیسلامییەوە کتێبییان نووسیوە، باسیان لێوە کردوە. لەبەر ئەوەی لەسەردەمی فتوحاتدا وڵاتی کوردان لە نێو دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمانی دابەش و داگیر کرابوو، بۆیە لە کاتی ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ ئەو دوو دەوڵەتەدا ڕاستەوخۆ یان نا ڕاستەوخۆ باس لە کورد و وڵاتی کوردان و چۆنیەتی گرتنی شار و شارۆچکە کوردییەکان کراوە. لەناو کوردانیش، مێژوونووسانی وەك شەرەفخانی بەدلیسی و مەردۆخی و موحەمەد ئەمین زەکی و صالح قەفتان و مەلا جەمیل ڕۆژ بەیانی لە کتێبەکانیان لێرە و لەوێ باسیان لە فتوحات کردووە، هەروەها هەندێ نووسەریش، کە لەبارەی مێژووی کوردەوە دەنووسن، وەك هەژار موکریانی و مەلا ڕەئوفی حەوێزی و ڕەفیق سابیر و حەسەن پێنجوینی و حەسەن مەحمود و و موحەمەد یوسف و ..هتد، چ وەك کتێب ، یاخود لێکۆڵینەوە و وتاریان لە بارەی فتوحاتەوە نووسیوە. ئەمەو چەند ماستەرنامەیە

ئاماژەیـان بەمەسـەلەی فتوحاتـەوە کـردووە، وەك ماسـتەرنامەکانی مامۆستایان : حوسامەدین نەقشەبەندی و فائیزە عیزەت و زرار سدیق و ئەحمەد میرزا و فرسەت مەرعی، هەروەها، شوان عوسمان.

بێگومـان چـاوەڕێ نـاکرێ ئـەو هـەموو نوسـەرانە، هـەمان تێـڕوانین و بۆچوونیان بۆ مەسەلەی فتوحاتی ئیسلامی هـەبێت، ئەو (جـودابینی) و (جوایەزحاڵی) بوونە، رەگێکی پێشینە و جوایەزی هزر و ئامانجی خۆی لـە پاڵدایە. نوسـەرێك کـە راڤەیـەکی ماددی بکاتـە پێـوەر بۆ ڕووداوەکـان، حەتمـەن قەناعـەت بـە ئەگـەری رۆحـی و دینـی نـاهێنێ. یـەکێکی تـر (ئایـدۆلۆژیای سیاسـی) و (بینینـی هەنوکـەیی) بـۆ مێـژوویکی وەك سەردەمی فتوحات بکاتە پێوەر و لە بەرژەوەندی ئایدۆلۆژیاکەی دانەبێ، ڕەوت و ئەگـەری ڕووداوەکان بەچاویلکەی ئایدۆلۆژیاکەیـەوە دەبینـێ. جا ئەگەر ئەمە ببێتـە دۆگما و بشفرێ هـەر بزن بێ، ئەو کاتە لێکۆڵینەوەکە ڕۆحیەتی بابەتیانە و زانستیانەی خۆی لە دەست دەدا.

بـەڕای مـن لـە شـرۆڤە کردنـی فتوحاتـدا سـێ مەسـەلە هـەن، هەریەکە تەواوکەری یەکترین، ئەوانەی دەیانەوێ لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژی و ڕای پێشوەخت دەربچن، دەبـێ حسـێبێکی ورد بـۆ ئـەو سـێ مەسـەلە گرنگـە بکـەن: یەکـەم: ژێـدەرە مێژوویيـەکان زۆر گـرنگن، نوسـەر گرنگیـان پێبـدا، بـەڵام ئـەو ژێدەرانـە دەبـێ (تحقیـق) بکرێن تـاکو ئەوانـەی پێیـان دەوتـرێ "ئیسرائیلیات" فـەرامۆش بکرێن لـە شیکردنەوەی ڕووداوەکان دا، دووەم: ماهیەتی ئیسلام و دیتنی ئیسلام بۆ مەسەلەی فتوحات، ئـەرێ مەسـەلەکە بانگەوازی و رزگارکردنی مرۆڤە لـە پەرستنی مرۆڤدا، یـاخود مەسـەلەکە

پەیوەستە بە دەسەڵاتی سیاسی و ئابوورییەوە، ئەم خاڵە زۆر گرنگە، چونکە ئەگەر نووسەر لە بنەماکانی ئیسلام نەگات، زۆر زەحمەتە بتوانێ لە هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر فتوحات بگات.

مەسەلەی سێیەم : چەکەرە کردنی بەڵگەی لۆژیکیە، ئەو سێ مەسەلەیە هەرسێ مرۆڤکردەن چونکە پابەندن بە تێروانینی نوسەر (وەك مرۆڤێك) بۆ بەڵگەی مێژوویی و بەڵگەی دینی و بەڵگەی لۆژیکی.

بابزانین ئەو سێ بەڵگەیە چی دوپاتدەکەنەوە، ڕزگارکردنی کوردستان، یاخود داگیر کردنی کوردستان؟! هەموو ژێدەرە مێژووییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، کە کورد لەسەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا نە "دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆ"ی هەبووە، نە "دینێکی نەتەوەیی سەربەخۆ"ی هەبووە، وڵاتەکەشی لە ژێر دەستی دوو دەسەڵاتی داگیرکەردا بووە، زۆربەی شەڕ و ململانێی ئەو دوو دەوڵەتە داگیرکەرەش، هەر لەسەر خاکی کوردان دا بووە، بەواتای کورد هەر باجی دابەشکردن و داگیرکردنی وڵاتەکەی نەداوە، بەڵکو لە نێوان بەرداشی ململانێی ئەو دوو داگیر کەرەش ژیان و کەلتور و بوونی لە بەربوونێکی(نەزیف) بوونێکی بەردەوام دا بووە!

هەر لەو پێودانگەوە، لە ڕووبەڕووبونەوەی لەشکری ئیسلام و ساسانی، یاخود ئیسلام و ڕۆمانی دا،چاوەڕێ دەکرێ "کورد" لەکام بەرە بێ؟!

(هەندێ) سەرچاوە و ژێدەر ئاماژە بەڕۆڵی یەکلاکەرەوەی کوردە موسڵمانبووەکان دەکەن لە شەڕی قادسیەدا، هەر ئاکامی ئەو شەڕەش وایکردووە بەشی کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەستی ساسانی،

دەسەڵاتێکی ئیسلامی کوردی لێ دابمەزرێ. بێگومان لەو بەشەی کوردستان شەڕ لە نێوان لەشکری ئیسلام و لەشکری ساسانییەکان ڕوویداوە، ئەگەر شەڕ بەرپانەبووبایە چۆن دەوڵەتێکی وەك دەوڵەتی ساسانی کە تەمەنی چوار سەد ساڵ زیاترە دەڕوخا؟!

ئاکامی ئەو دەڤەرە بە بەرژەوەندی کورد تەواو بوو، لە شاری مەدائینی پایتەختی ساسانییەکان (سەلمان فارسی) بووە سەردار، لە جەلەولا کوردێك لە لەشکری کوردی. هەروەها لە (حەلوان)یش کوردێك بەناوی (قوباد) بووە سەرداری ئەو شارە، ئەمە لە ڕووی (سیاسی)یەوە. لە ڕووی (دینی)شەوە کورد بوونە خاوەن یەك دین،نەك هەندێ (زەردەشتی) و هەندێ (مەجوسی) و هەندێ (مەسیحی) !

ئەمەو لەشەڕی نێوان لەشکری ئیسلام و لەشکری ڕۆمانیدا, بەدەگمەن ژێدەرێك باس لەوە دەکات لەشکری ئیسلامی شەڕی کوردی کردبێ، لەو بەشەشدا لە نێوان لەشکری ئیسلام و لەشکری ڕۆمانیش, شەڕێکی بەناوبانگی وەك شەڕی (قادسیە) و (نەهاوەند) نە قەوماوە، ئەو دەڤەرە بەحوکمی ئەوەی زۆربەی مەسیحی و گاور بوونە، زیاتر بەسوڵح و ئاشتی لەگەڵ لەشکری ئیسلام ڕێککەوتون. لە سەرچاوەکاندا هاتووە، کە (عومەیری ئەنصاری) والی جەزیرەی کوردستان، کە ئەو بەشەی لە ڕۆمانییەکان رزگارکردوە بە خاوەنی ڕەسەنی دەڤەرەکەی داوەتەوە، بێگومان خاوەنی ڕەسەنی دەڤەرەکەش کورد بوونە. لێرەدا ژێدەرەکان ئەو ڕاستییە دوپات دەکەنەوە، کە هەر شەڕێ لە ناوچەکەدا بەرپا بووبێ لە نێوان لەشکری ئیسلام و ساسانی، یاخود لەشکری ئیسلام و ڕۆمانیدا بووە، نەك لە نێوان لەشکری ئیسلام و کورددا بووبێ! جا کورد چۆن

شەڕی لەشکری ئیسلام بکات، کە خۆی نە دەسەڵاتی هەبێ، نە لەشکری هەبێ؟! هەندێ نوسەر وەك (مەلا رەئوف) و (مەلا جەمیل) و (د.رەفیق سابیر) و (د.شوان عوسمان) بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە لەشکری ئیسلام شەڕی کورد و کەلتوری کوردی کردووە!

ئایا هەموو کوردێك گوزارشت لە کوردێتی و خەمی کوردی و هەستی کوردی و کەلتوری کوردی دەکات؟! بێگومان لەناو لەشکری ساسانی و ڕۆمانیدا کورد هەبوونە، شیمانەی ئەوەش دەکرێ هەندێ فەرماندە و کاربەدەست بوونە، بەڵام ئەوانە بەرگریان لە کورد دەکرد, یاخود دەسەڵاتی داگیرکاری ساسانی و ڕۆمانی؟! ئەگەر وابێ, دەبێ ئەو هەموو (موستەشار) و (ئامیر مەفرەزە) و (ئاغا) و (دەرەبەگانە)ی, هەر لە شۆڕشی شێخ مەحمودەوە, هەتا ڕاپەڕینی ١٩٩١ کوردایەتییان کردبێ و بەرگریان لە کوردستان کردبێ، هەرچی (پێشمەرگە)ن، داگیرکەری کوردستان بوونە؟!

ئەرێ ئەو (کورد)انەی لە (قادسیەی سەدام) و (أم المعارك) کوژران بەرگریان لە کوردستان دەکرد؟! ئەرێ لەشەڕی کۆمەڵکوژی کوردیدا، کە سەدام ناوی نابوو (ئەنفال), ئەو سێ سەد فەوجەی جاشەکانی کورد لە پێشەوەی لەشکری عێراق نەبوون بۆ کوشتن و بڕین و کاولکردنی کوردستان؟ ئەرێ ئەوانە لە پێناو کورد وایان دەکرد یان لە پێناوی "عێراقی سەددام"دا؟!

سەبارەت بە مەسەلەی دووەم، دید و ئامانجی ئیسلام لەبارەی فتوحاتی "کوردستاندا"، چەمکی ئیسلام خۆی تەواو دەلالەت لە ئاشتی دەکا، هەتا ئەوی دی بیەوێ لە زمانی عەقڵ و دایەلۆگ بکات، ئیسلام

شـەڕی دەگـەڵ ناكـات، پێغەمبـەریش ﷺ سـێزدە سـاڵ لـە مەككـە بـەو لۆژیكەوە كەوتە گفتوگۆ دەگەڵ خەڵك و دەسەڵاتی دەڤەری خۆی، هەتا ناچار نەكراو هاوەڵانی لە شاری مەككە دەرنەكران و نەكوژران، شەڕی نەكرد. هەموو داخوازیەكەشی بریتی بوو لە "قولوا لا الـه الا الله تفلحوا".
خەلیفـە عومـەریش ﷺ بـەر لـەوەی شـەڕی دەوڵـەتی ساسـانی بكـات، شاندێكی نارد و داوای لە (یەزدگورد) كرد سەرپشك بێ لە نێوان سێ شت: (ئیسلام)، (جزیە)، (شەڕ)، خۆ ئەگەر یەزدگورد یەكەم، یان دووەمی قەبوڵ بكردبا، دەوڵەتەكەی هەر دەما، بەڵام ئەو سێیەمی هەڵبـژارد، لە ئاكام خۆی و دەوڵەتەكەی لە دەست دا.
هەرگیز ناتوانرێ نكوڵی لەوە بكرێ، كە لە مێژوودا هەندێ سەركردەی عەرەب ویستوویانە لە ڕێگای ئیسلامەوە عەرەبایەتی بەرپا بكەن، بەڵام ئاكام چی لێ كەوتەوە، ئەرێ عەرەبایـەتی و ناوچەگەری،چی بەعـەرەب بەخشی؟!
ئەرێ ئەو "عەرەبە موسڵمانە"ی، كە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لێی دەترسا، ئەمڕۆكە نەوەكانی لە ژێر ئاڵای عەرەبایەتیدا هەر هەمووی لە ژێر ڕەحمەتی دەوڵەتێكی سێ چوار ملیۆنیدا نیین؟! ئەرێ ئێستا عەرەب بێ ئیسلام، هەر لە قۆناغی جاهیلیدا ناژێت؟!
لە ئیسلامدا، تا ڕادەیەكی زۆر لۆژیك لە هەندێ پرس و ئارێشەدا ڕۆڵی خۆی هەیە، بەڵگەی لۆژیكیش لەسەر ئەوەی هیچ ململانێیەك لە نێوان (ئیسلام) و (كورد) لەئارادا نیە، خۆی لە خۆیدا مەسەلەیەكی بەڵگە نەویستە. ئەگەر لەگەڵ لۆژیكی ساخلەم و دروست بدوێین، دەبێ لە بەرامبەریدا بەچۆكدا بێین، كە كورد شەڕی ئیسلامی نەكردووە، كورد لە

حاڵەتی داگیرکردن دا بووە و هیچ دینێکی تایبەت بەخۆی نەبووە، لە ئیسلامیش دا هەریەکێ شایەتمان بێنێ، دەبێتە موسڵمان و جیاوازی ڕەگەز و زمان ئایەتێکن گوزارشت لە گەورەیی خوای گەورە دەکەن، جا ئەگەر گریمان مەسەلەکە دینیش نەبێ، کورد هیچ ئاگای لە ئیسلام نەبووبێ و ئەوەی سەردەمی فتوحاتیشی بتپەرست بووبن، خۆ هەر بۆ ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی داگیرکاری ساسانی و ڕۆمانی، دەبێ ئەو میللەتە هەر بۆ "تاقیکردنەوە" ئیسلامی قەبوڵ کردبێ؟! لە ڕاستیدا گەر لە دیدگای لۆژیکەوە لەمەسەلەکە بڕوانین دان بەوە دەنێین، کە خودی ئیسلام و ژێدەرە مێژووییەکان بەڵگەی دروستن لەسەر ئەوەی، کە زۆرینەی کورد بەئاشتی و سوڵح پێشوازی لە ئیسلام کردووە، هەر ئەمەش وای کردووە ئێستا لە ٩٨٪ی کورد موسڵمان بن.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەییە لە بارەی کتێبی (کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد) کە لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت، بەشی یەکەم لە لایەنی تەکنیکی و ئەکادیمی ئەم کتێبە دەکۆڵێتەوە، لەم بەشەدا ڕەخنە لە ئەدگارە پێویستیەکانی ماستەرنامەکەی کاک (د. شوان) دەگرێت. لە بەشی دووەمیش دا، کە خۆی لە شەش بابەت پێکدێ :بەئیسلام کردن، ئیسلام بوون، بە عەرەبکردنی کوردستان، ڕەوشی ئاینی و سیاسی کورد پێش ئیسلام، ڕزگارکردن و داگیرکردنی کوردستان لە هەردوو کتێبی (کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا) و(کوردستان و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد)، چەمکی جزیە و ڕۆڵی جزیە لە ڕزگارکردنی کوردستان بە ئاشتی، هەڵگەڕانەوە و ڕاپەڕینی شار و شارۆچکە کوردییەکان.

وێڕای ئەمانەش، بەرایەك و بابەتێك لە سەر پێستێك، کە بە ناو لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی و هەتا ئەمڕۆ ڕۆڵی گرینگی هەبووە تێهەڵکێشی ئەو بابەتە کراوە, هەروەها ئەم چاپی دووەمە بە ناوی خۆمەوە بێت.ئەم پاشکۆیەی لە کۆتایی هەیە بە حەوت ئەلقە لە گۆڤاری چرای ڕووناکی بڵاوبۆتەوە...

ئیتر بەو ئومێدەی لە ڕێی ئەم لێکۆڵینەوەدا، تیرێژێك لە ڕاستیەکانمان وەدەرخستبێت و ڕوون کردبێتەوە. با دڵە ڕۆشنەکانیش بە واقیع بینانەوە، لە ناخەوە ئامێزی حەقخوازی و ڕاست ویستی بۆ بکەنەوە و بە دڵێکی بێداری و بەرچاو ڕۆشنیەوە وەری بگرن، چیتر عەلمانی کورد,چ لە سەر ئاستی نوسەر و دەوڵەتەوە بێت, لاف ئەوە لێنەدات،کەئیسلام بە زەبری هێز لە کوردستان بڵاوبۆتەوە!!

سەلام ناوخۆش

# چەند سەرنجێك دەربارەی کتێبی کوردستان و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد

ئەم کتێبە لەبناغەدا خۆی ماستەرنامەکەی "شوان عوسمان موستەفا)یەو د. نەبەز مەجید سەرپەرشتی کردووەو لە ٢٠٠٢/٥/١٤ لیژنەیەك لەمامۆستایانی بەشی مێژووی کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی گفتوگۆیان لەسەر کردووەو پلەی (نایاب)یان داوەتێ[1].

بەحوکمی ئەوەی ئەم کتێبە ماستەرنامەیە، بۆیە دەبێ پەیڕەوی شێواز(میتۆد)ی ئەکادیمی بکات، چ لەشێوە تەکنیکیەی و، چ لەخستنەڕوو شرۆڤەکردنی بابەتەکە. لەم نووسینەدا هەوڵدەدەین سەرنج لەبارەی لایەنی تەکنیکی ئەکادیمیی و، هەروەها لایەنی بابەتی ماستەرنامەکە بخەینە ڕوو.

---

١- ماستەرنامەکەی کاك شوان عوسمان، سەنتەری چاپ و پەخشی (تەما) لە سلێمانی وەك کتێب بلاوی کردۆتەوە (سلێمانی –٢٠٠٢)

# بەشی یەکەم

## ماستەرنامەی

## "کوردستان و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد"

## لەڕووی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە

**لەم بەشەدا، هەندێ سەرنج، لەبارەی ناونیشانی ماستەرنامەکە، سنوری ماستەرنامەکە، هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە، شیکردنەوەی ژێدەرەکانی بابەتەکە، هەروەها لیژنەی گفتوگۆکە[1] دەخەینە ڕوو:**

**١- ناونیشانی بابەتی ئەکادیمی.**

**٢- سنووری بابەتی ئەکادیمیی.**

**٣- هۆی هەڵبژاردنی بابەت.**

**٤- شی کردنەوەی ژێدەرەکانی بابەتەکە.**

**٥-لیژنەی گفتوگۆ.**

---

١ - سەبارەت بەهەنگاوەکانی ڕێبازی زانستی لە لێکۆڵینەوەی مێژوویدا هەموو ژێدەر و سەرچاوەکانی ئەم بوارە ئەم هەنگاوانە بە مەرجی ئەکادیمی دادەنێن بۆ نمونە بڕوانە:

-Research and paragraph writing.

- د.محسن محمد حسين منهج البحث التاريخي.

- غازی فاتح وەیس: ڕێبازی لێکۆڵینەوە.

## ١- ناونیشانی بابەتی ئەکادیمی:

ناونیشان لە توێژینەوەی ئەکادیمیدا زۆر گرنگە، توێژەر ناچار دەکات کرۆکی بابەتەکەی، دەگەڵ ناونیشانەکە بسازێ و جۆرە هارمۆنیەك بسازێنێ. بەواتایەکی تر نابێ هیچ جۆرە ناکۆکی و هەڤدژیەك لەنێوان ناونیشان و کرۆکی بابەتەکە هەبێ.

لەدابی زانکۆیی و ئەکادیمیدا، کە ناونیشانێ پەسەند دەکرێ؛ نابێ پێشتر هیچ ماستەرنامە و دکتۆرا نامەیەك لەسەر هەمان بابەت نووسرابێ، بۆیە لەهەڵبژاردنی ناونیشاندا توێژەر و سەرپەرشتیار دەبێ وردبن، بۆ ئەوەی بەتایبەتی توێژەر رەنج بەخەسارنەبێ.

چەندان جار رێککەوتوە توێژەرێك ماوەیەك لەسەر بابەتێك کاری کردووە، بەڵام لە کاتی گەڕان بەدوای سەرچاواندا بۆی دەرکەوتووە، کە ئەو بابەتە لێکۆڵینەوەی لەسەرکراوە؛ بۆیە ناچار بووە ناونیشانی بابەتەکەی بگۆڕێ.

پێنج ساڵ پێش کاك شوان، دکتۆر (فرسەت مەرعی ئیسماعیل)، کە کوردێکی بەشی باشووری کوردستانە، ماستەرنامەکەی خۆی بەناوی (الکرد مصادر ومعالم تاریخهم فی صدر الاسلام (مرحلة الفتوحات) (١٦-هـ/ ٦٣٧م-٢١هـ -٦٤٢م) پێشکەش بە بەشی کۆلیژی ئادابی زانکۆی خەرتومی سودانی کردووە.

ماستەرنامەکەی (فرسەت) لەساڵی ١٩٩٨ەوە لەکوردستان هەیە، بە تایبەتی لەکتێبخانەی کۆلیژی ئادابی زانکۆی دهۆك و، کتێبخانەی ناوەندیی. بۆیە ناکرێ نە توێژەر و نە سەرپەرشتیار، لەو بارەیەوە هیچ

پاساوێك بهێننەوە (*) ئەمەو ماستەرنامەکەی کاك (فرسەت) زۆر ئەکادیمیترە لەوەی کاك شوان، چونکە بەر لەهەمووشتێ پەیڕەوی دوو دابی زانکۆیی گرنگی کردووە، یەکەم: سنووربەندکردنی لێکۆڵینەوەکەی (١٦)ی کۆچی بۆ (٢١)ی کۆچی. دووەم: ناونیشانو ناوەڕۆکەکە زۆر لەگەڵ یەك دەسازێن. هەروەها پەیڤەکانی ناونیشانەکە تەواو گوزارشت لەسەردەمی لێکۆڵینەوەکە دەکەن. نەك وەك کاك (شوان)، کە نەسنوری لێکۆڵینەوەکەی دیارەو نەناونیشانو ناوەڕۆکیشی بەم شێوەیە ئەکادیمین.

پەیڤی "کوردستان" بۆ لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیی، کە لەسەردەمی وڵاتگیری بدوێ، هەڵەیەکی ئەکادیمییە(**). جارێ "کوردستان" پەیڤێکی "ئەنەبیکویتی‌یە" دوو واتا لەخۆ دەگرێ: واتای جوگرافی و واتای نەتەوەیی. پەیڤی "کوردستان" بەهەردوو واتا، لە هیچ ژێدەرێکی کۆنی سەردەمی وڵاتگیری نەهاتووە. هەروەها لەژێدەرە کۆنەکانی یۆنانی وڕۆمی و سریانی و ئەرمەنی و فارسی و عەرەبیش نەهاتووە. ئەوسا یان " ئەقلیم جیبال" "ئەقلیم ئەکراد"، یاخود "عێراقی عەجەم"، یان

---

* لە ڕووی سیاسییەوە، ڕەوشی هەرێم لە ماوەی نووسینی ماستەرنامەکەی کاك (شوان)دا زۆر هێمن و ئارام بووە، هیچ جۆرە بارگرژییەك لە نێوان ئیدارەی هەولێر و سلێمانی لەئارادا نەبووە، هەتا بیکات بە بیانووی نەدیتنی ماستەرنامەکەی کاك فرسەت، یان ئەوانی دی!

** لە ماستەرنامەکانی پێش کاك (شوان عوسمان) دەرك بەو ڕاستییە زانستیە کراوە، بۆیە توێژەرەکان لە بریتی وشەی کوردستان (ئەقلیم جبال، بلاد الکرد، ئەقلیم الجزیرە، الکورد، الکرد)یان بەکار هێناوە.

"جەزیرە" یان میسۆپۆتامیا بەکارهاتوون[1]. بەگوێرەی ئەم ژێدەرانەی لەبەردەستن یەکەم سەرچاوە، کە ناوی کوردستانی تێدا هاتبێ، گەشتنامەکەی (مارکۆپۆلۆ)ی گەریدەی ئیتالّی یە (١٢٥٤-١٣٢٣). ئەو گەشتەی "پۆلۆ" لەسالّی ١٢٧١ بووە، لەوێش ناوی کوردستان بە (کاردستان) هاتووە[2]. لەدیدی د. جەمال رەشیددا (کارد) ئەو کوردانەن، کەلەبەشی شاخاویی موسلّ دەژینو، کاردستان مەملەکەتێك بووە لەمەمالیکی فارسو، دەکەوێتە رۆژئاواو باشوری ئەقلیمی جیبال، رۆژئاوای ئێرانی ئێستا[3]. ئەمەو حەمەدەالله مستوّفی قەزوینی لە " نزهة القلوب" بەدروستی ناوی "کوردستان" دەهێنێ، ئەو "کوردستانەی، کە قەزوێنی باسی لێوە دەکات، ئاماژەیەکی جوگرافیی- کارگێری لە خۆی دەگرێ، نەك چەمکێکی نەتەوەیی. لەسەردەمی مەغۆلی، ئێران هەشت ویلایەت بوو، کە (کوردستان) یەکێ لەوهەشت ویلایەتەبوو.

"ویلایەتی کوردستان، کە (قەزوێنی) باسی لێوە دەکات، تەنها لەشازدە شارو شارۆچکە پێکهاتبوو، قەلاّی "بەهار"ی باکوری هەمەدانی ئێستا، مەلّبەندی ویلایەتەکە بووە[4]. موحەمەد ئەمینی مێژوونووس، لە (قەزوێنی) و (لیسترنگ) ئەم زانیاریانە لەبارەی "ویلایەتی کوردستان"

---

١- بڕوانە ماستەرنامەکانی (فائیزە عیزەت) و (زرار سدیق) و (ئەحمەد میرزا) و (فرسەت مەرعی) و (مهدی قادر..).

٢ - بڕوانە هاجانی: صفحات من تاريخ الكرد و كردستان، اربيل ٢٠٠٢،ص٨٥.

٣- د.جمال رشيد احمد: دراسات في بلاد سوبارتو، بغداد، ١٩٨٥، ص١٣٧.

٤- حمدالله المستوفي قەزوینی: نزهە القلوب، ل١٢٨-١٢٩، حازم هاجانی، سەرچاوەی پێشوو، زرار صديق، ظهور تسميە کوردستان، مجلە مەتین، ژ: (٨٠).

دەخاتە ڕوو: "لە ئەواسیتی عەصری شەشەمینی هیجریدا، سوڵتان (سەنجەر)ی سەلجوقی لای غەربی جیبالی، کە تابیعی کرماشان بوو، جوێ کردەوە و ناوی نا "کوردستان" و (سلێمان شاە)ی برازای کرد بە حاکمی. دوو ساڵێك (٥٥٤-٥٥٦) تیاما؛ لەپاشدا لەجێگەی مامی بوو بەگەورەی سەلجوقی عێراقیان"[١] ئەمەش لەچەرخی دوازدەهەمی زایینی بووە، چونکە (سەنجەر) لەپاش ساڵی (٥١١ك١١١٧ز) دەسەڵاتی گرتۆتە دەست[٢]. لەسەردەمی وڵاتگیری ئیسلامیدا، وڵاتی کوردان بریتی بوو لەئەقلیمی (جیبال)، ئەم بەشە بریتی بوو لەعێراقی عەجەمی و غەربی ئەقلیمی (جیبال) و ئەقلیمی جەزیرە[٣]، ئەمەو زۆر زۆم و هۆبەی هۆزەکانی کورد، لەئەقلیم فارس و ئەرمینیا.. هەبوون[٤].

سەردەمی ماستەرنامەکەی کاك شوان بریتییە لە چەرخی حەوتەمی زایینی، کەچی پەیڤی "کوردستان" وەك یەکەیەکی کارگێری، تەنها بۆ بەشێك لە کوردستانی گەورە لای (مارکۆ) لەساڵی ١٢٧١و، لای (قەزوێنی) لە ساڵی ١٣٣٩ هاتووە! بێگومان ئەو "کوردستان"ەی کاك شوان باسی لێوە دەکات زۆر نوێیە، بۆیە بەهیچ پێوەرێکی ئەکادیمی ئەمە قبووڵ ناکرێت.

دەستەواژەی "بەئیسلام کردنی کورد" مەدلولێکی نێگەتیڤی هەیە، هەریەکێ ناونیشانەکە ببینێ؛ لە هەڵوێستی "تویژەر" دەگات و، دەزانێ

---

١ - موحەمەد ئەمینی زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٥

٢ - سەرچاوەی پێشوو

٣ - فرست مرعی اسماعیل، الامارات الاسلامیه، صفاو ٢٠٠٠.

٤ - کلثومة جمیل، الحیاه الدینیه و الاجتماعیه و الاقتصادیه لبلاد الکرد فی عهد الساسانیین، اربیل-٢٠٠٢.

"توێژەر" دەیەوێ بەراشکاوی بڵێ ئیسلام... بەزەبری شمشێر, یاخود بەچەوساندنەوەی ئابووری، یان بەجیاوازیی ئیتنیکی وکۆمەڵایەتی بەسەر کورد سەپێنراوە[1]. بەگوێرەی ناونیشانەکە دەبێت "کوردستان" بەشی (جیبال) و (جەزیرە) بەزەبری شمشێر بەئیسلام کرابن، بەڵام هەرچەند نوسەر هەوڵی زۆری داوە مێژوو بشێوێنێ، بەڵام لەهەندێ جێ ناچار بووە دان بەوەبنێ، کە هەرهیچ نەبێ خۆی واتەنی بەشی ئەقلیمی جەزیرە،بەگوێرەی سوڵحی (ئۆرفەیان)ی رەها کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان[*]!

دەبێ "توێژەر"و سەرپەرشتیار و لیژنەی گفتوگۆ؛ ئەوەندە لەکوردی کلۆل بن و جیاوازی لەنێوان " ئیسلام بوون- موسڵمان بوون" و "بەئیسلام کردن" نەکەن!؟

هەر لە چوارچێوەی " ناونیشان"ە کەوە, وابزانم لە ڕاستی دوور ناکەوینەوە، گەر بڵێین، ئەم ماستەرنامەیە کۆکردنەوەی چەند ماستەرنامەیەکی دیکەیە، وەك:-

١-فائیزة محمد عزت ماستەر نامەکەی بەناوی (الکرد في اقلیم الجزیرة وشهرزور في صدر الاسلام ١٦ك-١٣٢ك).

٢- زرار صدیق: الکورد في العصر العباسی حتی مجيء البویهیین ١٣٢ك-٣٣٤ك.

٣-ئەحمەد میرزا میرزا- غربي اقلیم الجبال في صدر الاسلام.

لەم سێ ماستەرنامەیەدا وەك لەناونیشانەکانیان دیارە، هەریەکەی

---

١- شوان عوسمان، کوردستان و پرۆسەی...، ل٢٣٦

* بڕوانە بەشی دووەمی ئەم نووسینە

باس لەبەشێکی ڕەوشی کورد دەکات لەسەردەمی بەرایی ئیسلامدا، بەواتای لەسەردەمی وڵاتگیری.

ئەمەو باس لەوە ناکەین، کە کتێبی "کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا" لەهەمان سەردەمی ماستەر نامەکەی کاك شوان دەدوێ، چونکە ئەم کتێبە لەدەرەوەی زانکۆ نووسراوە لە نەزەری "توێژەر" و "سەرپەرشتیار"، کتێبێکی زانستی وئەکادیمی نیە و، دوورە لە شێواز و ڕێگای، میتۆدی تویژینەوەی مێژوویی!! دوور لەچوار چێوەی ئەکادیمی، بەرگی کتێبەکە (کوردستان و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد) مۆرکێکی سیاسی لە خۆ دەگرێ، نەك ئەکادیمیی، کتێبەکە بەرگی ڕەشە و نووسینەکانی بەسۆز نووسراون، ئەوەش بێگومان گوزارشت لەدیدی نووسەر دەکات. ئەوە ڕای نووسەرە و لە دەرەوەی زانکۆ چاپکراوە. ئەگەر نووسەر ئاوا بەشێك لەمێژووی کورد "ڕەش بکات" ئەوا باچاك بزانێ لەم سەردەمەدا ئەم عەقڵیەتە مێژووی پێ نانوسرێ، چونکە چاك دەزانێ، کە لەپاش ڕوخانی دەوڵەتی میدیای کورد، هەر لەڕێگای ئیسلامەوە جارێکی تر هاتەوە ناومێژوو و جارێکی تر ڕۆڵی شارستانی خۆی لەشارستانیەکی دی نویێدا بینی، کەسیش ناتوانێ نکۆڵی ئەو ڕۆڵە مێژووییە و ستراتیژییە بکات، هەروەها بابێ گومان بێ، گەر ئیسلام نەگەیشتبا کوردستان، ئەوا لەنێوان بەرداشی ساسانی و ڕۆمانیدا، ئەمڕۆ گەلێك نەدەبوو بە ناوی کورد، ئەوانیش بەدەردی (ئاشوری) و (بابلی) دەچوون .

## ٢- سنووری بابەتی ئەکادیمیی:

دیاریکردنی سنووری لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی، کاری توێژەر زۆرئاسان دەکاو توێژەر تەواو لەکاری خۆی دەگا و بەرچاوی خۆی ڕوون دەبینێ. دەشێ بەئاسانی کۆنترۆڵی مەودای لێکۆڵینەوەکەی بکات، سنوربەند کردنی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیش بە دووشێوە دەکرێ. یەکەم: قۆناغ (کات- ماوە) دووەم: (بابەت)[1]. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دووشێوازە یەك دوو نمونە دەهێنینەوە، شێوازی قۆناغ: یاخود دیاریکردنی ماوە. لەمەدا ساڵ، سەردەم بەکار دەهێنرێ. بۆ نموونە: ماستەرنامەکەی مامۆستا (فرسەت مەرعی ئیسماعیل) بەمجۆرەیە، الکرد مصادر ومعالم تاریخهم في صدر الاسلام (مرحلة الفتوحات) ١٦ك-٢١ك.

هەروەها ماستەرەکەی (فائیزە محمد عزت) بەم جۆرەیە:-

الکرد في اقليم الجزيرة وشهرزور في صدر الاسلام ١٦ك-١٣٢ك. لە ماستەرنامەکەی کاك (فرسەت)دا خوێنەر چاوەڕێ دەکات کاك (فرسەت) تەنیا باسی قۆناغی وڵاتگیری لەساڵی (١٦)ی کۆچی، هەتا (٢١)ی کۆچی لەوەی مامۆستا (فائیزە) باسی کورد لە ساڵی (١٦)ی کۆچی هەتا (١٣٢)ی کۆچی بکرێت، هەروەها لە بریتی ساڵ، دەکرێ "سەردەم"یش بەکاربێ، وەك دکتۆرا نامەکەی مهدی قادر "الامن في العصر الايوبي في القاهرة".

هەندێ جار توێژەر لەڕووی ناوەڕۆکی بابەتەوە؛ توێژینەوەکەی خۆی

---

١- فوئاد ڕەشید، ئامادەبوونی ناونیشان لە پرۆسەی نووسین، ڕامان ژمارە (٦٨) ساڵ(٢٠٠٢)ل١٣٤- ١٣٥.

سنووربەند دەکات، وەك دکتۆرانامەکەی نەبەز مەجید "الاستخبارات في العصر الايوبي" و دکتورانامەی مەهدی قادر "الامن في العصر الايوبي".
لەم دوو دکتۆرانامەیە چاوەڕێ دەکرێ کە د. نەبەز تەنیا باسی "الاستخبارات" بکات، د. مهدی قادر باسی "الامن" بکات. زۆر جاران لەتوێژینەوە مێژووییەکاندا هەردوو جۆر شێواز لەگەڵ یەك دێن، هەر ئەو دوو دکتۆرانامەیە لەیەك کاتدا "قۆناغ" و "بابەت" لەخۆدەگرن. دەکرێ بوترێ ئەگەر هەردوو شێواز لەناونیشان پیادە بکرێ، ئەوا مەودای توێژینەوەکە بەرتەنگتر دەکاو، لێکۆڵینەوە زیاتر شاقولی دەبێ، نەك ئاسۆیی بەمەش توێژەر باشتر پەی بەکەل و قوژبنەکانی توێژینەوەکەی دەبات.

کە لە ناونیشانی ماستەرنامەکەی کاك (شوان) ورد دەبینەوە، هیچ کام لەو دووشێوازە بەدی ناکرێن. نازانرێ کاك (شوان) باسی چ قۆناغێکی وڵاتگیری، یان خۆی ئاسا "بەئیسلام کردنی کورد" دەکات. ئایا تەنیا باسی قۆناغی سەردەمی خەلافەتی راشیدی دەکا، یاخود سەردەمی ئەمەوییەکان، یاخود عەباسی‌یەکان؟! یان هەر هەموویان پێکەوە؟! ناونیشانەکە بەمجۆرە رووێکی ئەکادیمی نابەخشێ و خوێنەر نازانێ توێژەر مەبەستی چ وەخت و قۆناغێکە؟!

ئەگەر وەك بەڕێزان (فائزە)و (زرار)و (فرسەت) و (ئەحمەد میرزا)ی بکردبا، سنوری "لێکۆڵینەوەکەی" دیاری بکردبا، ئەوا هەم بابەتەکە ئەکادیمی دەبوو، هەم خۆی ئەوەندە ئارێشەی بۆ دروست نەدەبوو، هەروەها لە ڕووی بابەتەوەش، ناونیشانەکە تەواو لەگەڵ ناوەڕۆکەکە ناسازێ، هەردووکیش پێکەوە وەك ماستەرنامە و دکتۆرا نامەکانی دی

تەواوکەری یەکتر نین؛ بۆیە دەکرێ بڵێین ئەم ناونیشانە زیاتر ناونیشانێکی سیاسییە،نەك ئەکادیمیی، هەروەها لەناونیشانی "وتار"یش دەکات, نەك لێکۆڵینەوە!

## ٣- هۆی هەڵبژاردنی بابەت:

کاك شوان لە لاپەڕە چواری کتێبەکەیدا لەچەند دێرێکدا هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکەی ئاوا دەخاتە ڕوو: "تا ئێستا بەشێوەیەکی گشتی باس لەپرۆسەی بەموسڵمانان بوونی کورد نەکراوە،بەڵکو بەشێوەیەکی سادە و ساکار لە دوو توێی باسی تر، یان زۆر سەرپێیانە باسکراوە،یان باسی پرۆسەی گیرانی هەرێمێك لەهەرێمە کوردییەکان کراوە، یاخود بەشێوەیەکی لایەنگیرانە و نازانستی و نا ئەکادیمیی نووسراوە و, دوورە لە شێوازی (میتۆد)ی توێژینەوەی مێژوویی، هەروەها هاندانی زۆرو بەردەوامی مامۆستام، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر نەبەز مەجید، بوونە هۆی ئەوەی ئەم بابەتە هەلبژێرمو توێژینەوەی لەسەربکەم"[1].

پێش هەموو شتێ یەکێ لە ئەگەرەکانی هەڵبژاردنی بابەتی ئەکادیمی، نابێ پێشتر ئەم بابەتە ماستەرنامە و دکتۆرانامەی لەسەر نووسرابێ، ئەم بابەتەی کاك شوان پێشتر توێژینەوەی لەسەر کراوە، ماستەرنامەکەی کاك (فرسەت)یش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە، ئەمە لەلایەك, لەلایەکی تر کە دەڵێ: "تائێستا بەشێوەیەکی گشتی باس لەپرۆسەی موسڵمان بوونی کورد نەکراوە" ئەمە زۆر لەراستییەوە دوورە، چونکە پێش ئەو (واقیدي) و

---

١- شوان مستەفا، سەرچاوەی پێشوو، ل٤

(بەلازری) و (طبري) و (ابن كثير) و.. هتد لە ناو غەیرە،جگە لە کورد، کورد و لە ناو کوردانیش (مەلا سەلیمی حەویزی) و (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) باسی پرۆسەی بەموسلمان بوونی کوردیان کردووە[1]. هەروەها کاك (حەسەن مەحمود) کتێبێکی سێ سەد و نەوەد لاپەڕەی لەسەر ئەم بابەتە نووسیوە.هەروەها دەپرسین ئەرێ ماستەرنامەکەی بەڕێزان (ئەحمەد میرزا) و (فائیزە عیزەت) و (زرار سدیق) " سەرپێیانە باسی پرۆسەی گیرانی هەرێمێك لە هەرێمە کوردییەکانیان کردووە"؟! یاخود بەشێوەیەکی لایەنگیرانە و نازانستی و نائەکادیمی نووسرابن؟![2]. ئەوە گریمان کاك (شوان) بێ ئاگایە لەم سەرچاوانە، وەك خۆی لەلاپەڕە پێنجی کتێبەکەی دەنووسێ: "سەرچاوە ئەکادیمیەکانی ماجستێر و

---

١- مەلا ڕەئوفی حەویزی کوردستان و ئایینی ئیسلام.. ١٩٧٠، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی ولاتگیری ڕەشە خاکی عێراق، سلێمانی ١٩٩٧.

٢- سەیرم بە د.حسام الدین نەقشەبەندی دێ، چۆن ئەمەی لە کاك شوان عوسمان و د.نەبەزی سەرپەرشتیار قەبوولّ کردووە، چونکە د.حسام الدین سەرپەرشتیاری یاخود ئەندامی گفتوگۆ و ماستەرنامەکانی بەڕێزان (فائیزە) و (زرار صدیق) بووە؟! وەك لەبەشی دووەم باسی دەکەین، مەسەلەکە پێشتر بڕیاری لەسەر دراوە، دەبێ ئەو بەشەی مێژووی کورد بەچەواشەیی بنووسرێ، ئەمە ئەگەر وەك کتێبێك بنوسرابا، مەسەلەکە هێندە گرنگ نەدەبوو، بەلاّم زانکۆ بکرێتە پەرژینێك بۆ شێواندنی ئەمە "کارەساتە"!

لەهەمان کاتیش ئەم (ڕایە ئەزۆکانە) هەم مەرگەساتن، هەم بەزمەساتن، مەرگەساتن مێژووی میللەتێکی وەك کورد بەدەست کوردان ئاوا بنووسرێتەوە، بەزمە ساتیشە عەقلیەتی عەشایەری و "بشفرێ هەر بزنە!" لە نێو حەرەمی زانکۆ هەبێ!

گلەیی لە د.کاوێس قەفتان و د.کەمال عەلی ناکرێ، چونکە ئەوان لەو مەسەلەیە، بەزۆر کراون بەدکتۆر! هەروەها د.جەواد دەلێ: شەهادەکانی دەرەوە ئەدگاری تایبەتی هەیە بە مەرەمی تایبەتی دەدرێن و لە زۆر لایەنی زانستیەوە بەدەرن! شەهادەیان دەدەنێ هەتا بێنەوە لە ولاّتی خۆیان بەرچاو بن خەلّك بە دکتۆریان بزانێ!

**دکتۆرای زانکۆکانی عێراق لەکتێبخانەکانی تری شاری سلێمانی دانیە"[١] خۆ مامۆستای سەرپەرشتیار د. نەبەز مەجید پرۆفیسۆری یاریدەرە، دەبێ ئەویش ئاگای لەو سەرچاوانە نەبووبێ، یان دەبێ هەردووکیان بەهەربیانوویەك بێ خۆیان لەو سەرچاوانە گێل کردووە[٢]؟! هەروەها دەبێ بۆچی (د.نەبەز) ئەوەندە بەبەردەوامی هانی کاك شوانی دابێ بۆ ئەوەی لەسەر بەئیسلام کردنی "کورد بنووسێ"؟!!**

١- ئەم عەقلیەتە ئەکادییە هەر شتێ لە سلێمانی نەبێ، ئەوا هەموو دنیا خەراباتە، ئەوەی لە سلێمانی نییە، دڵنیابە لە هەولێر و دهۆك هەن، دەبێ کتێبخانەکانی سلێمانی شوێنی "موقەدەس" بن و ئێمە ئاگامان لێ نەبوو بێ؟!

٢- ئەگەر سەرچاوەی پێویست بە ماستەرنامە نەبێ، دەبێ قوتابی ناچاربێ یان بابەتەکەی بگۆرێ — کە ئەمەش ناکرێ سەبارەت بە کاك شوان، چونکە خۆی واتەنی: د.نەبەز هەر بە بەردەوامی هانی داوە لەسەر ئەم بابەتە بنووسێ، جا سەرچاوەی پێویست هەبن، یان نەبن ئەوە چ نیە. دیارە بەشی مێژووی.. زانکۆی سلێمانی بۆتە "سۆربۆن" "سیاسەتی" ماستەر و دکتۆرانەنتەماشی!" لەگەڵ (هەندێ لە قوتابیانی!) بەکاردێنێ! یان دەبێ ئەم شار و ئەوشار بکا و ئەو سەرچاوانە پەیدا بکات —ئەمەش بەکاك شوان عوسمان ناکرێ و پێویست نیە، چونکە ماستەر نامەکە مسۆگەرە!! جا من تەنیا پرسیارێك لە ئەکادیمیانی کوردستان دەکەم لە رێی خوا قوتابییەك خۆی بڵێ سەرچاوە ئەکادیمیەکانی بەردەست نەکەوتووە و کتێبە کۆنەکانی تەحقیق نەکراون و؛ ئەو بەکاری هێناون، لیژنەی گفتوگۆ بە چ پێوەرێکی ئەکادیمی "نایابی" داوەتێ؟!

## ٤- شیکردنەوەی ژێدەرەکانی بابەتەکە؛

لـە نووسـینی ئەکادیمیـدا، بـەکارهێنانی ژێـدەرو جـۆری ژێـدەری باوەڕپێکراو نووسـینەکە زیـاتر زانـستی دەکـات، ماسـتەرنامەکەی کـاک (شوان) لەبەکارهێنانی ژێدەرەکاندا دوچاری جۆرە نەسازی و ئاڵۆزیـەك بووە، چونکە پێشوەخت بڕیاری ئەوە دراوە، کەکورد بەئیسلام کراوە نەك بەسوڵح و ئاشتی موسڵمان بوو؛ بۆیە کتێبەکەی الواقدی(فتوح الشام)ی کردۆتە ژێدەری هەرە سەرەکی. هەرخۆیشی دەنووسێ، کە ئەم کتێبە و نووسەری کتێبەکە تۆمەتی زۆری لەسەرە، بەڵام کاك (شوان) ئەم هەموو "تۆمەتانـە" دەگەڕێنێتـەوە بـۆ جیـاوازی ئاینزایـەتی لـە نێو ئیسلامدا[١]! ئەمـەو کتێبـە کۆنـەکان دەبـێ تـەحقیق بکـرێن، ئینجـا دەبنـە کتێبـی باوەڕپێکراو. لەمەشدا کاك (شوان)هەر خۆی دەڵێ: ((کەمی سەرچاوەی ڕەسەن, یەکێ لەکۆسپەکان بووەو ئەوانەی بەردەستی کەوتون, زۆربەیان چاپەکانیان زۆرکۆنەو تەحقیقی تیادا نەکراوە))[٢]. هەروەها بیانوێکی دی بـێ بنـەما دەهێنێـتەوە لەمـەڕ بەدەسـت نەکـەوتنی ماسـتەرنامە و دکتۆرانامـەکانی زانکۆکـانی عێـراق، ئەوەی ئاگاداری مێـژووی ئیـسلامی بـێ، دەزانـێ لەکتێبخانـەی کۆلیـژی ئـادابی زانکـۆی سـەلاحەدین و کتێبخانـەی مەرکـەزیی، زۆربـەی هـەرە زۆری ئەم سەرچاوانە هەن! ئەمـەو لەکاتی نووسینی نامەکەدا هیچ ئاریشەیەك لە نێوان دەسەڵاتی هەولێر و سلێمانیدا نەبووە, تا کاك شوان بیکاتە هەنجەت و بیانوو!.

---

١- شوان عوسمان، سەرچاوەی پێشوو،ل٩.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل٥.

لەلاپەڕە چواری ماستەرنامەکەدا هاتووە، کەبەشێوەیەکی کەمتر سەرچاوەی کوردیو بیانیەکان بەکار هاتووە، بەڵام لەلاپەڕە حەڤدەشدا هاتووە: ((سوودی زۆرم لەم سەرچاوە تازانە بینیوە، کە بوونەتە دەروازەیەکیش بۆ چەند باسیٚ: لەتوێژینەوەکەم))! نووسەر سودی زۆر لەماستەرنامەکەی (حسام الدین نەقشەبەندی) بینیوە، وەك بڵێ ئەم ماستەرنامەیە کتێبێکی زۆر بە بەهایە، کەچی هیچ ئامـاژەی بەماستەرنامەکەی (فرسەت مەرعی) نەکردووە، کەنەك هەر لەسەر دەڤەرێکی وڵاتی کوردان نیە، بەڵکو هەموو دەڤەرە کوردیەکانی لەخۆ گرتووە. ئەمەو لەکاتی خوێندنەوەی ماستەرنامەکەی مامۆستا (حسام الدین)، بۆم دەرکەوت کە ئەم ماستەرنامەیە چەند ئەکادیمییە! بەجۆریٚ لیژنەی گفتوگۆ، بەشی دووەمی ماستەرنامەکەی ڕەتکردتەوە، کە دەربارەی ئایینە کۆنەکانی کوردو کوردو ئیسلام ومەزهەبە ئایینیەکانە[1]! هەروەها ئەم ماستەرنامەیە باسی سەدەی چوار و پێنجی کۆچی دەکا! ئەوەی کاك شوان لەبەرایی (١٣ی کۆچی) دەست پێدەکات! لە شیکردنەوەی سەرچاوەکاندا بۆچی باسی ماستەرنامەکانی مامۆستایان (فائیزە عیزەت) و (ئەحمەد میرزا) نەکراوە؟!

ئەمەو بۆچی کتێبە ناودارەکەی (ول دیوارنت) "قصة الحضارة" و کتێبەکەی (لوی ماسنیۆن)، هەر ئامـاژەشیان بۆ نەکراوە؟ سەبارەت بەژێدەرە تازەکان (پێم سەیرە!) بۆچی کاك شوان باسی کتێبەکەی

---

١- لەوانەیە د.حسام الدین ئەمە بکاتە کوردایەتی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر ئەو بەشەی ماستەرنامەکەی ئەکادیمی بوایە، مامۆستا عەرەبەکانی لیژنەی گفتوگۆ لە پێناوی "العروبە" گەورەتریان دەکرد!

مامۆستا حەسەن مەحمود "کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا" ناکات! ئەرێ ئەم کتێبە کتێبێکی هەمەلایەن نیە لەسەر پرۆسەی بەموسڵمان بوونی کورد؟ ئایا مەسەلەکە ئەگەرێکی ئەکادیمییە، یان ئەگەرێکی سیاسی؟!

ناکرێ کاک شوان بڵێ ئەم کتێبەم نەبینیووە، چونکە هەرخۆی لەلاپەڕە (١٥٧)ی کتێبەکەی لە پەراوێزدا ئاماژەی بەکتێبەکە کردووە. ئەگەر ئەگەرێکی سیاسی نەبێ, ئەقڵ قەبوڵی دەکا کتێبێکی سێ سەد لاپەڕەیی لەبارەی هەمان بابەت, تەنیا لەپەراوێزدا ئاماژەی بۆ بکرێ و، ماستەرنامەیەکیش تەنها باسی چەرخی چوارەمو پێنجەمی کۆچی بکاتو، بکرێتە سەرچاوەیەکی سەرەکیو، لەشیکردنەوەی سەرچاوەکاندا باس بکرێ[1]؟!

هەروەها سەبارەت بەبەکارهێنانی سەرچاوەکان،ماستەر نامەکە لە لاپەڕە(١٨) هەتا (٩٠) باسی شارەکانی هەردوو هەرێمی (جیبال) و (جەزیرە) دەکات هەر ئەم زانیاریانە لەچەندەها کتێبو ماستەرنامەی دی هاتوون. ئەوە کتێبەکەی مامۆستا (حەسەن)و مامۆستا (فرسەت) هەر بەتەواوی باسی موسڵمانبوونی ئەم شارانە دەکەن هەرچی ماستەرنامەکانن، ئەوی بەردەستن، پێش کاک شوان باسی ئەم شارانەیان کردووە:

١- حسام الدین عەلی غالب: الکرد فی الدینور وشهرزور، بەغدا ١٩٧٥، ل١٤-٤٦.

٢- فائیزە محمد عزت: الکرد فی اقلیم الجزیرە وشهرزور فی صدر

---

١- لەبەشی دووەم باسی ئەم ئەگەرە دەکەین.

الاسلام ١٦-١٣٢، هەولێر ١٩٩١ ل٤٠-٦٠

٣-زرار صديق: الكورد في العصر العباسي حتى مجيئ البويهيين ١٣٢-٣٤٤. هەولێر: ١٩٩٤ ل١٥-٤٣.

٤-فرسەت مەرعی: الامارات الاسلامية في بلاد الكرد في العصر العباسي الثاني، ٣٥٠-٥١١، دکتۆرانامە، سەنعا: ٢٠٠٠ لە لاپەڕە (٢١) هەتا (٤٢) باسی شارەکانی بەشی ڕۆژئاوای ئەقلیمی جیبال دەکات، لە لاپەڕە (٤٢) هەتا (٤٩) باسی شارەکانی ئەقلیمی عێراق دەکات، هەروەها لە لاپەڕە (٤٩) هەتا (٦٧) باسی شارەکانی ئەقلیمی جەزیرە دەکات، لەوانەیە لێرە کاک شوان بیانووێك بدۆزێتەوە و بڵێ، من لە سەرچاوە ڕەسەنەکانم وەرگرتوە، نەك ئەم کتێب و ماستەرنامە و دکتۆرانامانە.

گریمان کاك شوان ڕاست دەکات، بەڵام بوونی ئەم سەرچاوە کوردیانە پێشی ماستەرنامەکەی کاك شوان، لایەنی "عیلمیەت و ئەکادیمی" ماستەرنامەکە لاواز دەکات، چونکە ئەو ئامارەی بەو ڕاستیانە ناکات، هەروەها ئەوانە ئیسپات دەکەن، کە کارەکەی کاك شوان هیچ شتێکی نوێی تێدا نیە، هەر لە ڕووی ئەکادیمیەوە، دەبێ ماستەرنامە شتی نوێ بێنێ، نەك دوبارە کراو!

## ٥-لیژنەی گفتوگۆ

لەبەشی مێژوو سێ جۆر پسپۆڕێتی هەیە: مێژووی کۆن (قۆناغی پێش ئیسلام)، مێژووی ئیسلامی، مێژووی نوێ- هاوچەرخ.

هەرسێ لەیەك جودان، بەواتای ئەو مامۆستایەی پسپۆڕێتییەکەی لە

مێـژووی کۆنـە، نـاکرێ گفتوگـۆی ماسـتەرنامە و دکتـۆرای مێـژووی ئیسلامی، یاخود نوێ بکات. بەپێچەوانەشەوە، ئەمەش دابێکی ئەکادیمیە لە زانکۆکان پەیرەو دەکرێ، بەڵام ئەوەی لەبەشی مێژووی کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیـەکانی زانکۆی سلێمانی ڕوو دەدات، دوورە لـە هـەموو دابێکـی زانکۆیی!!

ماستەرنامەکەی کاك شوان دەچێتە خانەی "مێژووی ئیسلامی"، بۆیە دەبێ لیژنەی گفتوگۆ لە پسپۆرانی "مێژووی ئیسلامی" پێك بێ.

لیژنـەی گفتوگـۆی ماسـتەرنامەکە تـەنیا یـەکیان پـسپۆری مێـژووی ئیسلامییە، ئـەویش (د.حسام الدین نەقشەبەندی)یە، هەرچی دووەکـەی تـرن (د.کـاوێس قـەفتان) (کـە سـەرۆکی لیژنەکـە بووە!) و (د.کـەمال عـەلی) پسپۆریان لە مێژووی نوێیە!!

ئەمە هەر وەنـەبێ هـەر لـە گفتوگۆی ئـەم نامەیـە ئەمـە کرابێ، بـەڵکو لـە نامەی تریش هەر ئاوا کراوە، (ئاکۆ عەبدولکەریم) ماستەرنامەکەی بەناوی (شـاری سـلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢)ە، ئـەم نامەیـە، ماسـتەرنامەکەیە و لەچارچێوەی مێـژووی نـوێ دایـە، بـەڵام (د.نەبـەز مەجیـد) کـە مامۆسـتای مێژووی ئیسلامییە، سەرۆکی لیژنەکە بووە!!

ئەم بـێ سەروبەرییە و نائەکادیمیەتـە، هـیچ بیـانووێکی زانستی نیە، چـونکە دەبـێ زانکۆی سلێمانی چـی بێ، کـە دەبـێ ئەندامانی گفتوگۆی ماستەرنامە و دکتۆرنامە هەر "ئەهلی حەرەمی زانکۆی سلێمانی" بن!

لـە زانکـۆی سـەلاحەدین و دهـۆك، نـەك هـەر یاریـدەدەری پرۆفیـسۆر، بـەڵکو پرۆفیـسۆریش هەیـە، دەبـێ بۆچـی پرۆفیـسۆر (د.محـسن محمـد حـسێن) و (پرۆفیـسۆر د.ئەرسـەن ڕەشـید)، کـە هـەردووك پرۆفیـسۆرێتیەکەیان لـە مێـژووی ئیـسلامییە، بـۆ گفتوگـۆ کـردن لەسـەر

ماستەرنامەکەی کاك (شوان) بانگ نەکرابن؟! بۆچی (د.نەبەز) سەرۆکی لیژنەی ماستەرنامەکی ئاکۆ بێ، خۆ (د.کەمال مەزهەر) و (د.ئەحمەد عوسمان) و (د.عەبدولفەتاح بۆتانی) پسپۆریان لە مێژووی نوێیە، هەروەها هەرسێکیان بەتایبەتی د.کەمال مەزهەر، گفتوگۆیان لەسەر چەندەها ماستەرنامە کردوە و چەندەها توێژینەوەیان هەیە!

لەم ناتەبایی و نەسازییەی نێوان پسپۆری ئەندامانی لیژنەی گفتوگۆ، لەگەڵ بواری ماستەرنامەکەی کاك شوان، تەنزێکی گۆڤاری "وێران"م بیرکەوتەوە، کە پلار لە حاڵەتێکی ناساز و نەشاز و نائەکادیمی ئاوا دەدات، کەتا ڕادەیەك بۆتە دیاردەیەکی نازانستی لە خوێندنی باڵای زانکۆکانماندا، پلار و تەنزی "وێران" بەمجۆرەیە:

تازەترین نامەی دکتۆرا لە کوردستانی عێراقدا لەبواری ئەدەبی کوردیدا

ناونیشانی نامەی دکتۆرا کە : برایەتی کورد و عەرەب لە شیعری کوردیدا.

بەسەرپەرشتی : م.فەرەج مەغدید هەورامی ( ماجستێری هەیە لە زانستی مۆرفۆلۆژی )

ئەندامانی گفتوگۆی نامەکە :

١-د. محەمەد مەولود میران ( دکتۆرای هەیە لە فۆلکلۆری کوردی ).

٢-د. پێشەوا عەبدول کەرکوکی ( دکتۆرای هەیە لە جوگرافیای ئەفغانستان و پسپۆری ڕێزمانی کوردییە بە کۆمپیوتەر).

٣-م.نەبیل عەساف ( خاوەن بڕوانامەی ماجستێر لە بارەی زمانی ئینگلیزی لە مەڵبەندی عەنکاوەی هەولێر ).

٤-م.عەبدولرەزاق شەرەفکەندی ( خاوەن بڕوانامەی ماجستێرە لە بارەی زمانی کوردی لە مەڵبەندی خۆشناوەتیدا ).

٥-م.سیروان مەنگوڕی ( خاوەن بڕوانامەی ماجستێر بە پلەی خراپ نیە لە بارەی ڕاوەتاژی لە شیعری کوردیدا ). ...[1] !؟

---

١- گۆڤاری وێران ژمارە (٣-٤) زستانی ١٩٩٦، ل٦٩.



هەر چەندە ئەم پلار و تەنزەی "وێران" لە بواری (ئەدەبی کوردی)یە، بەڵام لە زۆر ڕووەوە لە گفتوگۆ کردن لەسەر هەندێ ماستەرنامەی بەشی مێژوو وەك ئەوەی کاك شوان و کاك ئاکۆ، یەکدەگرتەوە و سازە.

## کورتە ئەنجام:

پاش ئەوەی بەدیدێکی ئەکادیمی و بابەتی ئەم "ماستەرنامە"یەمان خوێندەوە، بۆمان دەرکەوت، کە لە زۆربەی هەنگاوەکانی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی دا (ناونیشان، هەڵبژاردنی بابەت، سنوربەند کردنی بابەت، شیکردنەوەی ژێدەرەکان، پسپۆری ئەندامانی لیژنەی گفتوگۆ) لەمەرجە زانستی و ئەکادیمیەکان بەدەرە و، خوێنەر هەست ناکات لەبەردەم لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی دایە، بەڵکو زیاتر لە کتێبێکی ئیعلامی سیاسی دەچێ؟ هەر لێرەوەش دەگەینە ئەو دەرەنجامەی، کە ئەو "پلەی نایابەی" کە بەنامەکەی کاك شوان بەخشراوە، نایابێکی سیاسییە یاخود خاترانەیە, نەك ئەکادیمی[1].

---

١- لە کاتی گفتوگۆ کردن لەسەر "ماستەرنامەکەی" کاك (شوان عوسمان)دا کاك (موعتەسەم نەجمەدین) لە لاپەڕە (٥)ی ژمارە (٣٣)ی ساڵی دووەمی ڕۆژنامەی "هەواڵ"دا دەنووسێ، کە لیژنەی گفتوگۆ "مشت و مڕی ئەوەیان هەبووە، کە ئەم نامەیە نەك حەقی وەرگرتنی بڕوانامەی ماستەری بە پلەی نایاب هەیە، بەڵکو حەقی وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرای ڕاستەوخۆی هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە هیچ یاسایەکی هاوشێوەی دانشگا ئەورووپییەکانمان نییە لە بەخشینی بڕوانامەی دکتۆرا ڕاستەوخۆ، بۆیە بڕیاردرا ئەم نامەیە بەپلەی ئیمتیاز وەربگیرێ بۆ بڕوانامەی ماستەر"! بەڕاستی ئەکادیمیەتە! خۆزیا ئەوەندەشتان کردبا؟!!!!

# بەشی دووەم

## بابەتەکانی کتێبی کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد

لەم بەشدا هەوڵدەدەین لەو شەش خاڵە بدوێین, کە کتێبی "کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلامکردنی کورد"ی لە پێناودا نووسراوە.

بابەتی یەکەم: بە ئیسلامکردن یاخود بە ئیسلامبوونی کورد؟!

بابەتی دووەم: بەعەرەبکردنی وڵاتی کوردان.

بابەتی سێیەم: ڕەوشی ئایینی و سیاسی کورد پێش ئیسلام.

بابەتی چوارەم: "ڕزگارکردن" و "داگیرکردنی" کوردستان لە هەردوو کتێبی "کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا" و کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد"

بابەتی پێنجەم: چەمکی جزیە و ڕۆڵی جزیە لە رزگارکردنی کوردستان بە ئاشتی.

بابەتی شەشەم: هۆکارەکانی هەڵگەڕانەوەی شار و شارۆچکە کوردیەکان.

# بابەتی یەکەم

# بە ئیسلامکردن یاخود بە ئیسلامبوونی کورد؟!

هەر چەندە ناونیشانی کتێبەکە بە ئاشکرا دەیەوێ بڵێ، کورد بە زەبری هێز بۆتە موسڵمان، کورد بە شمشێر ئیسلامکراوە، نەك بە خۆهێشتی خۆی ئیسلامی هەڵبژاردبێ، ئەمە دەلالەتی ناونیشانەکەیە، بەڵام وەك بڵێی کاکی نووسەر، کوردی چاك نەزانێ و جیاوازی لە نێوان بە ئیسلامکردنو بەئیسلامبوون نەکات کە لە زۆر جێ "موسڵمانبوون" و "ئیسلامبوونیشی" بەکار هێناوە، بەجۆرێ هەر بەشی دووەمی کتێبەکە ئاوایە: میکانیزمی پرۆسەی بە ئیسلام بوونی کورد"، بەڵام کە هەر شەش باسەکەی ئەم بەشە دەخوێنیتەوە، بۆت دەردەکەوێ، کە نوسەر هەر مەبەستی بە ئیسلام کردنە, نەك ئیسلام بوون!

بە گوێرەی ژێدەرە مێژووییەکان، ئەرێ کورد بە ئیسلامکراوە, یاخود لە ڕێگای سوڵح و عەقڵەوە موسڵمانبووە؟!

بەر لەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە، ئەرێ کوردستان لەسەردەمی فتوحات دا لە ژێر دەستی کێدا بووە؟ ئەرێ سنوری نەتەوەیی کوردی هەبووە؟ ئەرێ سوپایەکی کوردی هەبووە؟

کورد بەر لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی, سێزدە سەدە بوو لە ژێر دەستی ئەخمینی و شاکانی فیرسی و ساسانیەکان و ڕۆمەکان دا بووە[1].
لە پاش ڕوخاندنی ئیمپراتۆریەتی میدیا لە ٥٥٠ پ.ز لە لایەن

---

١- سەلام، ئایا ڕاستە ئیسلام کوردستانی داگیر کردووە، ئاڵای ئیسلام، ژمارە (٣) هەولێر ١٩٩٣.

ئەخمینیەکانەوە، ڕۆژێکی نوێ لە ژیانی فارس دروست بوو، ئەم ڕۆژە بە ڕۆژێکی ڕەش بۆ کورد دادەنرێ"[1].

لە پاش ئەم هەرەسە گەورەیە، کورد وەك نەتەوەیەك دوچاری گەفی لەنێوبردن بوو، ناچار بوو بەکۆمەڵ بەرەو چیا ڕەو بکەن، هەر ئەمەش وایکردووە، کورد زیاتر بەرەو چیانی ڕەوەندی و کۆچەری بچێ، فارسەکانیش بەرەو مەدەنیەت و ژیانی شاریی. هەروەها بۆ شێواندنی مێژووی کوردیش، چەندەها هەوڵ دراوە، کە زیاتر ناسنامەی نەتەوەیی و ڕەسەنی کورد ناوزڕاوتر بکرێ، بە حوکمی ئەوەی پاش هەرەسەکە، کورد زیاتر کۆچەر بوون، فیردەوسی و مەسعودی ڕەگەزی کورد بۆ جنۆکە و بەرەی بیژی جنۆکە و ڕەگەزی عارەب و فارس ببەنەوە. لەسەردەمی فتوحات؛ وڵاتی کوردان بریتی بوو لە دوو ئەقلیمی سەرەکی:١- ئەقلیمی جیبال، ئەم ئەقلیمە لە دوو بەش پێکدەهات، بەشە مەزنەکەیان عێراقی عەجەمی و بەشی دووەم ئەقلیمی غەربی جیبال، کە (قەزوینی) بە کوردستان ناوی دەبات، ٢-ئەقلیمی جەزیرە[2]. ئەمەو کورد لە ئەقلیمی خوزستان و ئەقلیمی فارس هەبوون.

مێژوونووسانی وەك الاصطخري، المقدسي دەنووسن، کە لە ئەقلیمی فارسدا پێنج زۆمی دەوارنشینی کورد هەبوونە[3].

---

١- د.عبدالله مصطفى امجاد الاكراد، أربيل، ٢٠٠٢، ص٢٧ ئێستاش لەگەڵ دابێ مێژوو لە کورد چەواشە دەکرێ. (نەورۆز) لە کورد دەکرێ بەڕۆژێکی نەتەوەیی و ڕەمزی رزگاری، بەڵام لە ڕاستیدا مەسەلەکە پێچەوانەیە!!

٢- ابن حوقل: صوره الارض،ص٣٠٤، ابوالفداوتقويم البلدان،ص٤٠٨.

٣- الاصطخري: المسالك و الممالك،ص٧٢، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٣٣٩-٣٤٠، هەروەها بڕوانە محمد امين زەكی، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ل٢٣٠-٢٣١.

هەروەها هەندێ گەریدەکانی عەرەب (یاقوت الحموی) و (ابن حوقل) دەنووسن، کە چەندەها هۆبەی کورد لە ئەقلیمی فارسدا هەبوونە[1]. هەردوو ئەقلیمی جیبال و جەزیرە لە نێو بەرداشی ململانێی ڕۆم و بێزەنتی و ساسانیەکاندا باجێکی زۆریان داوە. هەردوو دەسەڵات تەواوی وڵاتی کوردانیان بۆ پەرژەوەندی خۆیان قۆرخ کرد بوو.

با لێرەوە وەڵامی پرسیارەکە بدەینەوە، لە نەزەری شەرەفخان و محمد ئەمین زەکی، زۆربەی کورد لە ڕێگای سوڵحەوە موسڵمان بوونە.

مێژوونووسانی مێژووی ئیسلامی لەو باوەڕەن، کە جابانی کوردی یەکەم کوردە هاتۆتە خزمەت پێغەمبەری ئیسلام موسڵمان بووە، دکتۆر عبداللە مصطفی لە "امجاد الاکراد" دەنووسێ: کە هەر لە ڕێگای جابانی کوردی و مەیمونی کوڕی جابانی کوردی و دێلمی سەرکردەی سوپای تایبەتی کیسرا, ئیسلامەتی بەنهێنی لە دەڤەری کوردان بەتایبەتی ئەقلیمی جیبال بڵاوبۆتەوە[2]. هەر د.عبداللە دەنووسێ، کە جابانی کوردی و مەیمونی کوڕی لەگەڵ دێلم, سوپایەکی گەورەیان پێکهێنا بوو، هەر ئەم سوپایە توانی سەرکەوتنی موسڵمانان لە قادسیە یەکلا بکاتەوە، هەر بەیارمەتی ئەو کوردە موسڵمانانە, مەدائین، لە پاشان جەلەولا و حەلوان لە سوپای ساسانی ڕزگار کران[3]، هەروەها لە ژێدەرە مێژوویەکاندا هاتووە، کە خەلیفەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب ﷺ، سەلمانی

---

١- ابن حوقل، صوره الارج،ص٢٤٠-٢٤١. یاقوت الحموی: معجم البلدان،ج٣،ص٧١ هەروەها بڕوانە کلثومة، ص٧٤.

٢- عبداللە مصطفی ، (أمجاد أكراد)، ص٣٢-٣٣.

٣- عبداللە مصطفی (أمجاد الاكراد) ص٣٣.

فارسی کردۆتە والی (مەدائین) و دوو کەسیشی لە کوردەکان کردۆتە والی حەلوان و جەلەولا[١].

ڕۆژبەیانی و ڕەفیق و سایر و شوان عوسمان باوەڕیان وایە، کە دەڤەری ئەقلیم جیبال و ڕەشە خاکی عێراق، بەزەبری شمشێر بە ئیسلام کراون، بەڵام کە لە ڕەوتی ڕووداوەکان ورد دەبینەوە، دەگەینە چەند ڕاستییەك لەوانە: دەبێ دەسەڵاتی ئیسلامی کوردی، لە دەسەڵاتی ساسانی فارسی جیا بکرێتەوە.

لە پاش ڕزگارکردنی مەدائین و حەلوان و جەلەولا، دەسەڵاتێکی ئیسلامی کوردی بەرپا بیو، ئەو ئاغا و دەرەبەگانەی لەناو سوپای ساسانی دا بوون؛ بە هیچ جۆرێ نوێنەری کورد نەبوون، بەڵکو بەرگریان لە دەسەڵاتی داگیرکاری ساسانی دەکرد[٢]، لەناو دەڤەری ژێر دەسەڵاتی ساسانیدا ململانێیەکی ئایینی، هەتا خوێناوی لە نێوان زەردەشتیەت و فەلایەتی و جولەکایەتی بەرپا بوو[٣].

زەردەشتیەت، یەکخواپەرستی خۆی لە دەستدا بوو، تێکەڵ کرابوو بە بت پەرستی، بۆیە ئەم دینە تێکەڵە، بەرگەی فەلایەتی و گاورایەتی و جولەکایەتی نە دەگرت، هەر چەندە سەرکردەکانی ساسانی و هەندێ لە ئاغاکانی کورد، نەیانتوانی چیدی کورد فریو بدەن و ناچاریان بکەن شەڕی لەشکری ئیسلام بکەن، بەڵام بە حوکمی ئەوەی زۆرمەکانی کورد لە

---

١- سەرچاوەی پێشوو، هەروەها بڕوانە المسعودی: مروج الذهب، ج٢، ص٣٠٦ هەروەها (طبری)، لە بەشی چوارەم، ل٢٢٠ و ابن الاثیر لە بەشی دووەم، ل١٤٥ باس لەوە دەکەن کە "قوباد" کە سەرکردەیەکی کورد بوو لە سوپای دێلم بۆتە سەرداری حەلوان.

٢- ئارام عبدالسلام: ڕەوشی ئاینی کورد پێش ئیسلام، ڕۆژنامەی دەنگی غەریبان ژ (١) ل٣.

٣- لە بابەتی سێیەم بەدرێژی باسی ئەم خاڵە دەکەین.

دەڤەری فارس و هۆبەکانی کورد, لە هەندێ دەڤەری فارس و ئەهواز دا تەواو لەژێر دەسەڵاتی ساسانی دا بوون. هەروەها ئەم زۆم و هۆبانە زیاتر ڕەوەنـدی و کۆچـەری بـوون, هـەروەها بەرژەوەنـدیان پەیوەسـت بـوو بەدەسەڵاتی ساسانیەوە، بۆیە ناچار بوون لە هەندێ شەڕدا ببنە قوربانی بەرژەوەندییەکانی ساسانی.

هەرچی دەڤەری جەزیرەیە، لەشەرەفنامەدا هاتووە، کە کۆمەڵێك کوردی بازرگانی هۆزی –باجن– لە جەزیرەی بۆتانەوە چوونەتە (تایف)، لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ موسڵمان بوون، کە ژمارەیان –٩– کەس بووە، دواتر هەموو کورد لەسەر دەستی ئەم نۆ کەسە موسڵمان بوون[١].

ئەو دەڤەرەی وڵاتی کوردان, کە زیاتر لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمەکان دا بووە، فەلایەتی لە بەشێکی زۆری شارەکان بڵاوبۆوە، ئەم دوو دیاردەیە وایکردووە, کە زۆربەی شارەکان بەخۆهێشتی خۆیان یاخود بەسوڵح لەگەڵ موسـڵمانان موسـڵمان بوونـە، لـەم بارەیـەوە هـەتا زۆر لـە مێژوونووسـانی ڕۆژئاوا دان بـەوە دەنـێن, ئەوەتـە (ئارنوڵـد تـوینبی) لـە بەشـی دووەمـی "مێژووی بەشـەریەت"، دەنووسـێ، کـە کـورد بەسـوڵح و ئاشتی بە ئیسلام ڕازی بوونە. ویل دیورانت دەنووسێ: بەڕاستی سوپای ئیسلام چاکتر بوو لە سوپای فارس و ڕۆم.. هـەرگیز لـە جەنگدا دڕنـدە نـەبوو "ئەمـەش خـاڵێکی دی بـوو, کـە کـورد لـە زۆر شـوێن بـەبێ شـەڕ موسڵمان بن[٢].

هەر سەبارەت بەم مەسەلەیە، (تۆماس ئارنۆڵد) دەڵێت: ((مەحاڵە, کە

---

١- شەرەفنامە، ل١٤، شوان عوسمان: کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد، ل١٤١-١٤٢.

٢- حەسەن محمود: کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا،ل٢٦

بکوترێت موسڵمانەکان لە گرتنی ناوچەکانی وڵاتی ساسانی هێزیان بەکارهێنابێت لە پێناو سەپاندنی ئایینی ئیسلام بەسەر دانیشتوانی ناوچەکە)) [1]. و (جۆرج سێڵSale)ی وەرگێڕی قورئانی پیرۆز بۆ سەر زمانی ئینگلیزی دەڵێت: ((بەڕاستی خەڵەتاو و فریودراون ئەوانەی خەیاڵ بکەن، کە ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبۆتەوە)) [2].

سەحابی (عیاض بن غنم الفهري) یەکەم سەرکردەی سوپای ئیسلام بووە، کە هاتۆتە قوڵایی کوردستان، یەکەم رێککەوتنامەی سوڵحی لەگەڵ بەتریکی زۆزان لە ساڵی (١٩)ی کۆچیدا مۆر کردووە، هەروەها هەر لە دەڤەرەکەدا, رێککەوتنامەی دی لەئارادا بووە لە نێوان سەرکردەکانی سوپای ئیسلام و دانیشتوانی ناوچەکە، رێککەوتنامەی سوڵحی نێوان (حذيفة بن اليمامة) و (مەرزەبانی ئازەربایجانی) لە ئەردەبێل [3].

لەمەدا دەفامرێتەوە، کە کورد بەر لە ئیسلام زەردەشتی، فەلە، یاخود بەشێك جولەکە بوونە، کە ئەمە وایکردووە لە عەرەبە بتپەرستەکان زووتر ئیسلام قەبووڵ بکەن. هەروەها ئەو حاڵەتە وای لە سوپای ئیسلام کردووە، کە سێ رێ لە پێش کورد دابنێ: ئیسلام بوون، جزیە دان، یان شەڕ. کەچی لە بەرامبەر عەرەب: ئیسلام, یاخود شەڕ!

میری موسڵمانانیش داوای لەسەرکردە سەربازییەکانی کرد، کە مامەڵەی "أهل الكتاب" لەگەڵ کوردان بکەن [4].

---

١- الدعوة الى الاسلام، ص٢٣٩.

٢- هەمان سەرچاوە، ص١٦.

٣- أحمد عادل كمال، سقوط المدائن، ص١٤٦-١٤٧. فرست مرعی اسماعیل:الكرد...،ص١٨٢

٤- كارل بروكلمان، تاريخ الشعوب الاسلامية، ص٧٩

ئەمەو هیچ دەسەڵاتێکی کوردی لە ئەقلیمی جیبال و جەزیرە لە ئارادا نەبووە، ئەوەی هەبووە دەسەڵاتێکی ساسانی و رۆمی بووە، هەر تەنها لە پاش موسڵمانبوونی کورد، جارێکی تر دەسەڵاتێکی کوردی بەعەقڵیەتێکی نوێ لە کوردستان دامەزراوە. ئەو دەسەڵاتە مەعریفیە، نەك هەر ڕەگی لە خاکی کورددا کوتاوە، بەڵکو لە دەروونی کوردیش، ئەمەو هەتا کاك شوانیش نەیتوانی ئەو ڕاستییە تۆمار نەکات، کە ئەقلیمی جەزیرە لە ڕێگای سوڵح و ڕێککەوتنەوە قەبوڵی دەسەڵاتی ئیسلامیان کردووە،سوڵحی ڕەها یاخود، ئۆرفە بنەمایەك بوو شارەکانی جەزیرە لەگەڵ موسڵمانان ڕێککەوتن[1].

ئەگەر ئەمە وانەبووبێ، ئەوە دەبوو لەپاش کزبوونی دەسەڵاتی ئیسلام لە هەرێمەکاندا، کورد یەکەم میللەت بن، کە لە ئیسلام هەڵگەڕێنەوە، کەچی لە کتێبە مێژووییەکاندا هاتووە، کە سەردەمی ئیسلامی؛ سەردەمی زێڕینی کورد بووە، دەسەڵاتی ساسانی و ڕۆمی بەسەردا نەماوە. هەروەها هەر لەسەدەی چوارەمی کۆچیەوە چەندەها میرنشینی ئیسلامی لە نیشتمانی کورد دامەزراون، وەك میرنشینی حەسنەوی (٣٥٠-٤٠٦ ك)، میرنشینی مەروانی (٣٧٣-٤٧٨ ك) میرنشینی عەنازی -عەیاری (٣٨١-٥١١ ك) [2]. دەوڵەتی ئەییوبی کوردی وەڵامێکی دیکەیە بۆ ئەو کەسانەی، کە گومان لە یەکێتی کورد و ئیسلام دەکەن. لە لایەکی دی کاك شوان دەیەوێ جیاوازی لە نێوان کورد لەهەمبەر زەردەشتیەت و فەلایەتی و ئیسلام دا بکات.

---

١- شوان عوسمان، ل

٢- بڕوانە دکتۆرانامەکەی فرست مرعی: الامارات الاسلامية في بلاد الكرد.

یەکێ ئاگای لە مێژوو نەبێ و ئەم کتێبە بخوێنێتەوە، وا هەست دەکات، کە دەبێ هەردوو ئاینی زەردەشتی و فەلایەتی، دوو ئاینی نەتەوەیی (ئەتنیکی) کورد بن! هەر چەندە لە زۆربەی سەرچاوەکاندا هاتووە، کە زۆربەی کورد پەیڕەوی زەردەشتیەتیان کردووە، بەڵام ئەم ئاینە ئاینێکی کوردی نەبووە، بەڵکو کورد لەپاش هەرەسی دەوڵەتی میدیا، زیاتر کۆچەری بوونە، بۆیە زۆر درەنگ بە زەردەشتیەت ڕازی بوونە[1]. هەتا لە هەندێ سەرچاوە هاتووە، کە لەبەر ئەوەی کورد زەردەشتیەتیان قەبوڵ نەکردووە، بۆیە زەردەشت زێدی خۆی بەجێ هێشتووە، ئەمەو زەردەشتیەت ببوە "ئاینی ڕەسمی" ساسانی، کە بەسەر کورد و غەیرە کورد سەپێندرابوو، نەك "ئاینێکی خۆهێشتی" بوبێ. ئەمەو زەردەشتیەت و فەلایەتی لە ململانێدا بوونە، نەك لەگەڵ یەك سازان وەك شوان دەنووسێ.

لەسەردەمی شابوری دووەم؛ هەڕەشەیەکی مەزن لە فەلەکانی نێو دەوڵەتی ساسانی کران، بەجۆرێ هەر لە سەردەمی شابوری دووەمدا ٣٣٩-٣٧٩ چل ساڵ سەرانی ساسانی و پیاوانی زەردەشتی،کەوتنە چەوساندنەوەی هەمە لایەنەی فەلەکان، ئەمەو لە نامیلکەکەی "کوردە مەسیحیەکانی سەردەمی ساسانی"دا هاتووە، کە پیاوانی ئاینی زەردەشتی چییان بەسەر فەلە کوردەکاندا هێناوە، ئەمەو قەرەداغی حاکیمی ئەدیاب، یەکێ لە قوربانیەکانی دەسەڵاتی ساسانی زەردەشتی بوو[2].

---

١- ڕەشاد میران،ڕەوشی ئاینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، ل٢٦

٢- بۆ زیاتر شارەزایی لەم بابەتە، لە بابەتی سێیەم ئەم خاڵەمان بە درێژ تر باس کردووە..

کاك شوان دەنووسێ: ((ئایینەکانی کورد –زەردەشتیەت و مەسیحیەت-
رەگێکی مێژوویی و گیانی کۆن و قووڵیان لە دەروونی خەڵکدا هەبوو، هاوکات
ببون بەبەشێك لە پێکهاتەی کولتوری کۆمەڵگای کورد)) [1].

ئەمەو وەك لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا ئەم دوو ئایینە کوردی نەبوونە،
کورد چ زەردەشتی بووبێ، یان مەسیحی، هەر باجی داوە بەدەست
دەسەڵاتی ساسانی و ڕۆمی، چونکە هەردوو ئایین (ئایینی ڕەسمی)
دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمی بوون، بۆیە کورد ناچاربوون لە ئەقلیمی جیبال
زەردەشتی بن، لە ئەقلیمی جەزیرە مەسیحی، هەر لە هەمان لاپەڕە
دەنووسێ" ..کەچی لە پڕێکا هێزێکی سەربازی هات و بەزەبری شمشێر، یاخود بە
چەوساندنەوەی ئابووری، یان بە جیاوازیی ئیتنیکی و کۆمەلایەتی، ئاینێکی تازە و
نامۆیان بەسەردا دەسەپاندن، کە لە زۆر لایەنەوە نامۆ بوو بە پێکهاتەی کولتوری و
گیانی و کۆمەڵگای کوردی."

ئەم دەربڕینەی کاك شوان لەهەمبەر ئیسلام و پێناسەکردنی بە
ئاینێکی عەسکەری و نامۆ و داگیرکار، هەوڵدانێکە بۆ شێواندنی مێژوو،
چونکە خۆی چاکدەزانێ، ئەگەر ئیسلام نامۆ و داگیرکەر با، زەردەشتیەت
و مەسیحیەت، بەشێکی ڕۆحی پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردی بووبان،
دەبوو ئێستا ٩٨٪ زەردەشتی، یان مەسیحی بووبان، نەك موسڵمان!

نازانم بۆ هەندە؛ هەندێ نوسەری کوردی ئەمڕۆ زیاتر پەسەندی
زەردەشتیەت و مەسیحیەت دەکەن، نەك ئیسلام. ئەگەر مەسەلەکە ئایینی
و ڕۆحی بێ، ئەوا هەردوو ئایینەکە بەشێوە دروستەکەیان، بەشێکن لە
ئیسلام، هەروەها باوەڕبوون بە پێغەمبەرایەتی، کتێبی هەر پێغەمبەرێك

---

١- شوان عوسمان، ل٢٣٦.

بەشێكی گرنگی پێكهاتەی باوەڕی موسڵمان پێكدێنێ، هەروەها وەك ئاماژەمان دا هیچیان ئایینی نەتەوەیی نین و بەشێك لە كەلتوری نەتەوەیی كورد پێكناهێنن، بەڵام هەموو مەسەلەكە جۆری ئایینەكە نیە. ئەگەرنا فەرهاد شاكەلی واتەنی، دەبێ چی زەردەشتیەت بەكەڵكی ئەمڕۆی كورد بێ؛ تاكو ببوژێنرێتەوە. هەروەها هەرچی مەسیحیەكانی كوردستانن خۆیان بەكورد نازانن و لەڕووی نەتەوەییەوە خۆیان بە ئاشووری دەزانن. بەڕای من مەسەلەكە هەرەسی ئایدۆلۆژیای سیاسی كوردیەیە، لەبەرامبەر ئەم هەڕەشەش، ئیسلام بەشێوە سروشتیەكەی جارێكی تر بۆتەوە بەشێك لە ژیان و بیركردنەوە و شەریعەت و فیكری مرۆڤی كوردەوە.

كاك شوان لە زۆر جێ باسی هەڵگەڕانەوە و یاخی بوون لە دەسەڵاتی ئیسلامی دەكات، وەك بڵێی ئەمە دۆزینەوەیەكی نوێ بێ[1]؟!

وەتا ئیسلام لەگەڵ خودی مرۆڤ تێكەڵ نەبێ، بیركردنەوە و تێڕوانین و دنیا دیتنی مرۆڤ لەسەر بنەمای خۆهێشتی نەبێ؛ هەڵگەڕانەوە، یاخی بوون دوو دیاردەی سروشتی دەبن.

عەرەب پێش كورد لە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە، لە پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هەندێ هۆزی عەرەب لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە،كە ئامادە نەبوون "زەكات" بدەن، هەروەها كەسێكی وەك "موسەیلەمە" بانگەشەی "پێغەمبەرایەتی"یشی دەكرد، لە بەرامبەردا خەلیفە ئەبوبەكر شەڕی لەگەڵ كردن! هەرچی "هەڵگەڕانەوەكانی" ناو كوردەكانیشە چەند فاكتەری خۆی هەبووە.!!

یەك: هەڵگەڕانەوەكان زیاتر لە دەڤەری دەرەوەی وڵاتی كوردان بووە،

---

١- ئەم بابەتە لە بابەتی شەشەمدا باسكراوە.

لەو نێوەش، لێرە و لەوێ کاریگەری ئاینی کۆن لە لایەك، وروژاندنی مەسەلەکە زیاتر بەدەست ئەو کەسانەوە بووە, کە بەرژەوەندیان لە دەسەڵاتی ساسانی یاخود رۆمانی بووە؟!

دوو: ماوەی موسڵمانبوونەکە ئەوەندە نەبووە، ئیسلام تەواو کاریگەری خۆی لەسەر هەموو تاکی دەڤەرەکە بکات، ئەمەو لە هەندێ کاتدا بەتایبەتی لە پاش خەلافەتی عومەر، یاخیبوونەکان "ریفرومی-چاکسازی" بوونە، هەندێ لە خەڵکی دەڤەرەکە ویستویانە ئیسلام تەواو بەرێك وپێکی پەیرەو بکرێ.

# بابەتی دووەم
# بەعەرەبکردنی وڵاتی کوردان

خوێندنەوە و دیتنی مێژووی کۆن بە عەقلیەت و پێوەری ئەمڕۆ، یەکێ لەو کارەساتانەیە، کە هەڕەشە لە عیلمیەت و ئەکادیمیەت دەکات، لە لایەکی تر لە ڕووی زانستیەوە دەبێ شتەکان بە پێوەری بیرۆکەکە لێکبدرێتەوە.

بۆ نموونە، کە باسی ئیسلام دەکرێ، دەبێ بە گوێرەی بنەماکان و دیدی ئیسلام لە ئیسلام بڕوانرێ. هەروەها کەباس لە عەلمانیەت دەکرێ دەبێ دیدی عەلمانی بۆ بنەماکانی عەلمانیەت پەیڕەو بکرێ..

ئیسلام، کە عەرەبایەتی بە پەتایەکی بۆگەن و ئاژاوە دابنێ، چۆن دەکرێ مرۆڤێکی موسڵمان خەبات لە پێناوی بوژاندنەوەی عەرەبایەتی بکات؟! کاک شوان لە لاپەڕە (٢٥٥) هەتا لاپەڕە (٢٦٥) دەیەوێ واپیشانبدا، کە ئیسلام ڕۆڵی سەرەکی بینیوە لە بەعەرەبکردنی وڵاتی کوردان، زۆر نووسەر بەر لە شوان، وەك جەمال نەبەز، ڕەفیق سابیر، خەلیل ئیسماعیل، جەزا تۆفیق و ئیدی، بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە پرۆسەی بە عەرەبکردنی کوردستان، هاوکات بووە لەگەڵ هاتنی سوپای ئیسلام بۆ وڵاتی کوردان.

بابزانین دەبێ ڕاست بێ بەر لە ئیسلام، عەرەب لە وڵاتی کوردان نەبوونە؟ لە سەرچاوە مێژوویی و جوگرافیەکان وەك : "فتوح البلدان"، "تاريخ الطبري"، "المسالك و الممالك"، "مروج الذهب"، "الكامل ف التاريخ"، "البداية و النهاية"، "صبح الاعشى"، "صورة الارض"،..هتد

باس لەوە دەکرێ، کە بێجگە لە کورد، فارس و ڕۆم و یۆنانی و ئەرمەنی و عەرەب، پێش هاتنی سوپای ئیسلام لە وڵاتی کوردان ژیاون.

(طبري) و (ابن کثیر) باس لەوە دەکەن، کە پەیوەندی لە نێوان ساسانیەکان و عەرەبەکان هەبووە، هەروەها لە "الکامل"دا هاتووە، کە پەیوەندی عەسکەریش لە نێوان (شا یەزدەبرد) و (مونزری کوڕی نەعمانی) عەرەبی مەنازرە هەبووە، هەر ئەو پەیوەندیەش بەنەزەری حەسەن شەمسانی وایکردووە، کە عەرەب بەرەو ئەقلیمی جەزیرە بێن. هێنری فیلد لە "جنوب کردستان" دەنووسێ: زۆربەی ئەو عەرەبانەی بەرەو ئەقلیمی جەزیرە دەهاتن مەڕدار بوون، ئەستەخری لە "المسالك و الممالك" هەر ئەو حاڵەتە دوبارە دەکاتەوە و دەنووسێ: (ئەو عەرەبانە زیاتر مەڕ و ئەسپیان هەبوو، نەك حوشتر،) ابن فقیە دەنووسێ: کە "عەرەب پێش ئیسلام گەیشت بوونە شەهرەزوور"[1] هەروەها لە ناوچەی (ئامەد) کۆمەڵێ عەرەبی قەبیلەی (بەکر) و (مەزر) لە پێش ئیسلام هەبوونە، هەتا ناوی "دیاربەکر" یاخود "دیار مضر" دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو قەبیلانە لەناوچەکەدا. ئەم دیاردەیە پاڵی بە هەندێ نووسەر، وەك مەسعودی و هەندێ نووسەری هاوچەرخ بنێ، کە هەر نەك "دیاربەکر" بەبەشێك لە خاکی عەرەب دابنێن، بەڵکو بنەچەی کوردیش بگەڕێننەوە بۆ عەرەب[2]!!

ئەم دیاردەیە زۆر سەیر نیە لە مێژوودا، چونکە هەتا کوردەکانیش لە کۆندا لە زۆر بەشی خاکی فارسی دا هەبوونە، زۆمەکانی کورد، هۆبەکانی

---

١- مختصر كتاب البلدان، ص١٣٠، ن محب الله:موقع الاکراد و کردستان، ص٥٦.

٢- سەلام ناوخۆش، سێکوچکەی هەرەس، بەشی دووەم.

کورد لە دەڤەرەکانی فارس و ئازربایجان و ئەرمەنیا لە کۆندا دیاردەیەکی سروشتی بووە، ئێستاش کورد لە ئوردن و یەمەن و میسر هەیە، دەبێ عەرەب بڵێن کورد داگیر کەرن و هاتونە وڵاتی عەرەب داگیر بکەن!!

با بگەڕێینەوە سەر سوپای ئیسلام و پرۆسەی بەعەرەبکردنی وڵاتی کوردان، کاک شوان دەنووسێ: "هاوشان لەگەڵ پرۆسەی لەشکرکێشی و دەست بەسەراگرتنی هەرێمە کوردنشینەکان، دەوڵەتی خەلافەتی عەرەبی ئیسلامی سیاسی، بە عەرەبکردنی پیادە دەکرد، ئەویش بە نیشتەجێ کردنی هۆزە عەرەبەکانی نیمچە دورگەی عەرەبی لە هەرێمە داگیرکراوەکان[1].

کاک شوان وا پیشاندەدا، کە ئەم دەقە لە "فتوح البلدان–ل١٨٢" و "الخراج و صناعة الكتابة– ل٣١٥" هاتووە....

لەم دەقەدا کاک شوان زۆر شت دەگۆڕێ، یەك: "ئیسلامی سیاسی"، چەمکێکی نوێیە بە هیچ جۆرێ لەو دوو سەرچاوە نەهاتووە، دوو: بەعەرەبکردنی نوێیە؛ ئەوسا نووسەرانی ئەوکاتە هاتنی سوپای ئیسلام بۆ دەرەوەی دورگەی عەرەبی، بە "عەرەبکردن"یان دانەدەنا، سێ: کاك شوان (فتح) بە (داگیرکردن) دەزانێ کەچی "فتح" لە تێڕوانینی ئیسلامیدا بە (ڕزگارکردن) دێ، ڕۆژبەیانیش لە "ڕەشە خاك" (فتح) بە داگیرکردن دەبینێ، ڕەفیق سابیریش لە "بەرەو مێژوو" و "ئیمپراتۆری لم" هەر ئەو ڕایەی هەیە. ئەرێ پسپۆرانی مێژوو: کورد و وڵاتی کوردان ئازاد و رزگاربوون؛ هەتا ئیسلام داگیری بکات، یان پێچەوانە لە لایەن ڕۆم و ساسانیەوە داگیر کرابوون و ئیسلام هات ڕزگاری کردن؟! کاك شوان لەو چەند لاپەڕەی تایبەتە بە "بەعەرەبکردنی کوردستان" چەندەها هۆکار

---

١- شوان عوسمان، ل٢٥٥.

دەخاتە ڕوو، گوایە "بە عەرەبکردنی کوردستان" چەندین مەبەست و مەرامی لە پشتەوە بووە، وەك:

١-جێگیرکردنی دەسەڵاتی ڕامیاری دەوڵەتی خەلافەت.

٢-داگیرکردنی عەسکەری، ئەویش بە دامەزراندنی ئوردوی سەربازی.

٣-مسۆگەر کردنی دەستکەوتی ئابووری.

٤-مەبەستی ئایینی و سەپاندنی زمانی عەرەبی.

٥-بەرپاکردنی دەسەڵاتی چاودێری بەسەر جم و جوڵی کوردان.

٦-هۆکاری کۆمەڵایەتی و ڕزگاربوون لە کێشەی ناوخۆی کۆمەڵگای عەرەبی[1].

لە نەزەری کاك شوان, ئەم هۆکارانە هەموویان بەیەکەوە بوونە هۆی ئەوەی، کە جاڕی سیاسەتی بەعەرەبکردنی هەرێمە داگیرکراوەکان بدەن.

جارێ بەر لە هەموو شتێ, هاتنی سوپای ئیسلام بەهیچ جۆرێ بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان نەبووە، بەڵکو بۆ بە ئیسلامبونی کۆمەڵگە و کەلتور و ئایین و تاکی کورد بووە. دەوڵەتی خەلافەت دەوڵەتی دەسەڵاتی عەرەب نەبووە، بەڵکو دەوڵەتی سەرجەم موسڵمانان بووە، ئەو دەوڵەتە لەسەردەمی خەلیفەی ئیسلامدا،شەڕی دەسەڵاتی عەرەبی کرد، کە ئامادە نەبوو (زەکات) بە هەژارانی دەوڵەتی ئیسلامی بدات. لەگەڵ موسڵمانبوونی کورد، کورد بووە بەشێك لە ئوممەی ئیسلامی. لەو پێودانگەوە، کورد بەشێك بووە لە ڕامیاری دەوڵەتی ئیسلامی، پاراستنی دەوڵەتی خەلافەتیش بەشێك بووە لە ئەرکی کورد لە هەمبەر سوپای داگیرکاری ساسانی و ڕۆمی، بوونی ئۆردوی عەسکەری لە ناوەوە و

---

١- هەمان سەرچاوە، ل٢٥٥.

دەرەوەی شارەکان لە سەرەتای ڕزگارکردنی کوردستان، لە دەسەڵاتی ساسانی و ڕۆمی و دەست و پێوەندەکانیان، پێویستییەکی عەسکەری و ئەمنی؛ هەر دەسەڵاتێکی نوێیە، ئیسلام نەك هەر ئەمنی مرۆڤی موسڵمانی لەلا گرنگە، بەڵکو پاراستنی ئەمنی و سەلامەتی "اهل الذمة"ش لە ئەستۆی دەسەڵاتی ئیسلامیە، هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان و نوسەرانی ناحەزی ئیسلام بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە مەبەست لە فتوحاتی ئیسلامیدا، دابین کردنی ئابوری و بەدەست هێنانی تاڵان و دەستکەوت بووە. خەلیفەی ئیسلام عومەری کوڕی خەتاب هەموو جیهانی ئیسلامی لە ژێر دەست بوو، بەڵام خۆی یەکێ لە هەژارانی دەوڵەتی خەلافەتی خۆی بوو، یەکێ لە والیەکانی ئەقلیمی جەزیرە, کە (عومەیر) بوو، یەکێ لەو هەژارانە بوو، کە خەلیفە عومەر سەد دیناری لە بوودجەی دەوڵەت پێدا, ئەویش هەر هەمووی بەسەر هەژارانی کورد دابەشکرد[1].

ئەو دەستکەوتەی لەشەڕ بە دەست موسڵمانان دەکەوێ، بە پێی سورەتی (الأنفال), هەر خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان هەیە چۆن چۆنی دابەشی بکەن.

ڕاستە دەڤەری کوردی لە دەڤەری تر لە هەندێ شت دەوڵەمەندتر بووە، بەڵام بەرهەمی دەڤەری کوردی لە عەرەب خەرج نەدەکرا و کوردی لێ بێبەش بکرێ، وەك ساسانیەکان و ڕۆمەکان وەیان دەکرد.

هەرچی مەسەلەی زمانە، کاك شوان وەك فاکتەرێکی سەپاندنی دەسەڵاتی عەرەبی دەبینێ، هەرگیز موسڵمانەکانی سەردەمی خەلافەت, جورئەتی ئەوەیان نەکردووە, کە زمانی قورئان (بە دیدێکی قەومی) بەسەر

---

١- بڕوانە حەسەن محمود، کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا.

گەلانی عەرەب دا بسەپێنن، چونکە ڕەتکردنەوەی زمانی کوردی و هەر زمانێکی تر؛ ڕەتکردنەوەی ئایەتێکی مەزنی خوای گەورەیە!!

هیچ بەڵگەیەك لە ئارادا نیە، کە زمانی کوردی پێش بە موسڵمانبوونی کورد،هیچ ڕۆڵێکی هەبووبێ، ئەمەش سەیر نیە، چونکە لە ماوەی نێوان (٥٥٠پ.ز) هەتا (٦٣٧ز) کورد هیچ دەسەڵاتێکی سیاسی نەبووە، هەتا زمانی کوردی لە دام و دەزگاکان بەکار بێ.

هیچ سەرچاوەیەکیش نیە، کە بیسەلمێنێ زمانی (ئاوێستا) زمانی کوردی بووبێ، هەتا زۆر ژێدەر دوپاتی دەکەن، کە زمانی (ئاوێستا) زمانێکی تایبەت بە خودی زەردەشت بووە، خەڵك لە پاشان لە (زەند) و (پازەند) لە زەردەشتیەت گەیشتوون!! هەروەها هەر لە ڕێگای زمانی عەرەبییەوە، ئەلفبای کوردی لەسەر ئەلفبای عەرەبی دامەزراوە، هیچ سەرچاوەیەکیش نیە جەخت لە لەسەر هەبوونی ئەلف بایەکی کوردی بەر لە ئیسلام بکات؟!ئەگەر هەشبوبێ لە کاتی تالأنبرۆی ساسانیدا لەناوچووە یان ئەوەندە دەسەڵاتی نەبووە.

هەروەها ئەگەر عەرەبە موسڵمانەکان مەبەستیان بووبێ لە ڕێگای زمانی قورئانەوە پرۆسەی بەعەرەبکردنی وڵاتی کوردان بسەپێنن، ئەوا دەبوو لەماوەی ئەو چواردە سەدەیەدا, کورد لە غەیری عەرەبی هیچ زمانێکی تری نەزانیبوایە؟!

هەروەها دەبوایە ئیسلامییەکانی کورد هەرگیز "بە زمانی کوردی" قورئانیان ڕاڤە نە کردبوایە؟!

هەر گیز لە ئیسلام دا نیە، کەس ڕەگەزی خۆی بگۆڕێ و خۆی بکا بە "عەرەب"، چونکە "کورد بوون" ئایەتێکی خوداییە، ئەمە و ئەگەر کورد

هێندە دژە عەرەب بووبان، سەرکردە کوردەکان (بەشانازییەوە) رەگەزی خۆیان بۆ موسڵمانە عەرەبەکان نەدەگەڕاندەوە؟! کەسێکی وەك خالیدی کوڕی وەلید، کە هیچ نەوەی لەدوا بەجێ نەماوە، بەڵام هەندێ لە سەرانی کورد زێدی بنەماڵەی خۆیان گەڕاندۆتەوە بۆ ئەو[1]؟!

عەرەبەکانی پێشوو، ئەوانەی ئیسلام لەگەڵیان تێکەڵ بوو، ئەو نەوە قورئانییە بوون، کە شانازی هەموو موسڵمانێکن، هەر لەو ڕوانگەوەش بووە کە سەران و زانایانی کورد بنەچەی خۆیان بردۆتە سەر ئەوان. هەرچی زۆربەی عەرەبی ئەمڕۆیە لە لایەن زۆربەی کوردەوە رەمزی داگیرکردن و چەوساندنەوەن، چونکە بە کورتی لە "ئیسلام" لایان داوە، بۆیە هیچ کوردێ ئەمڕۆ، نەك شانازی بەوە ناکات، کە ئەصڵی عەرەبی بێ، بەڵکو ئامادەیە لە زێدی خۆی بەڕووت و قوتی دەربچێ، بەڵام نەبێتە عەرەب!!

هەرچی کاك شوان (عەرەبی موسڵمان)ی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلافەت لەگەڵ (عەرەبی بەعس) لەیەك جیا ناکاتەوە، لەمەشدا ئامانجی خۆی هەیە، دەیەوێ بە نەوەی نوێی کورد بڵێ، جیاوازییەك نیە، هەردووکی هەر داگیرکارن!!

هەردووك هەر بە شمشێر هاتونەتە کوردستان؟! ئەمەیە عەقڵیەتی مەعریفی ئەکادیمیەتی کاك شوان و لیژنەی گفتوگۆکەی؟!

کورد، کە بووە بە بەشێك لە ئیسلام، هەر خۆی داکۆکی لە خاکی خۆی کردووە، ئەمەش هەر بەر لە هاتنی سوپای ئیسلام بۆ هەرێمەکانیان بەرپا بووە!

---

١- بۆ زیاتر تەماشای شەرەفنامە بکە.

جابان و مەیمون و دێلمی سەحابە، کە چەندەها ساڵ بە نهێنی موسڵمانێتی خۆیان پاراستووە، لە هەمان کاتیش لەناو سوپای ساسانی دا بوونە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو عەقڵیەتە مەعریفی و عەسکەریەی ئەو موسڵمانە کوردانەی بەرایی، کە کوردەکانی جیبال و جەزیرە موسڵمان بوون، بێگومان بەشداریان لە سوپای ئیسلام دا کردووە. هەروەها بەپێی لۆژیک سەرانی ساسانی و ڕۆمانی و هەندێ لە ئاغای کورد، کە بەرژەوەندیان لەگەڵ سەرانی ساسانی و ڕۆمانی دا بووە، هەندێ جم و جۆڵی سەربازیان کردووە، سوپای ئیسلام ناچار بووە چاودێریان بخاتە سەر، سەربازێکی موسڵمان ناتوانێ چاودێری ماڵێکی موسڵمان بکات، چونکە نەك هەر پاراستنی ئەم ماڵە موسڵمانە، بەڵکو پاراستنی ماڵی ئەو گاورانەشی لە ئەستۆیە، کە لە قەلەمڕەوی دەسەڵاتی ئیسلامی دان!!

بەڵگەیەکی لۆژیکی بۆ کاك شوان دەهێنمەوە، پاش ڕاپەڕین ئەرکی سەرشانی هەموو "کوردێکی دڵسۆز" نەبوو، کە چاودێری نەیارانی کورد بکات بۆ ئەوەی تەناهی و ئاسایش بەرقەرار بێ؟!

کێشەی کۆمەڵایەتی و ناکۆکی نێوان تیرە و هۆزەکان دیاردەیەکی سروشتی بووە، ئەو کێشەیە هەر لەناو عەرەبدا نەبووە. بەڵکو هەتا لەناو ساسانی و ڕۆم و کوردەکانیش دا هەبووە، لە نێوان ساسانیەکان؛ ئاریشەکان هەر تەنیا لەنێو هۆزەکاندا نەبووە، بەڵکو لە نێو قەلەمڕەوی دەسەڵاتیشدا بەرپا بووە.

بۆ نموونە ساسانیەکان، ململانێیەکی زۆریان لەسەر دەسەڵات هەبوو و تووشی گێچەڵی ببون. لە ماوەی تەنیا هەشت ساڵدا ٦٢٨ز تا ٦٣٦ نۆ پاشا و دوو شاژن فەرمانڕەواییان کرد.. تەنیا لە ساڵی ٦٣٤ز دا پێنج

**شا و شاژن فەرمانڕەواییان کرد[1]. بێزەنتییەکانیش بە هەمان دەردی ساسانییەکان چوبوون، لەلایەکەوە شەڕ پڕژەی لەبەر بڕیبون، لە لایەکی تریشەوە توشی زنجیرەیەك ناکۆکی ئایینی و دابەش بوونی کەنیسە ببون[2]. ئەمە و هەروەك لە زۆربەی سەرچاوە کۆنەکاندا هاتووە, کە گاور و جولەکە لە قەلەمڕەوی ساسانیدا لە ڕەوشێکی زۆر ناخۆشدا بوونە، بێگومان کوردە غەیرە گاورەکانیش لە ژێر دەسەلاتی رۆمانەکان – بێزەنتییەکان–دا باریان خراپ بوو!**

**ئەمە و زەردەشتیەت "ئایینی ڕەسمی" دەوڵەتی ساسانی بوو، مەسیحیەتیش "ئایینی ڕەسمی" دەوڵەتی بێزەنتی بووە، جا ئەگەر لە دوو دەوڵەتی "شارستانیی" و "ئایینی" ئەو هەموو کێشە ئایینی و مەزهەبی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییە بەرپابێ، بێگومان لە دورگەی عەرەبی، کە بتپەرستی عیبادەت بووە، ڕەوشی کۆمەڵایەتی خراپتر بووە.**

**هەر لە کۆنەوە هەتا رۆژگاری ئەمڕۆش, چەندەها هۆز و تیرە،ناچار لەبەر هەندێ کێشەی تیرەگەری و هەندێ ئارێشەی کۆمەڵایەتی، زێدی خۆیان بەجێهێشتووە.**

**کاك شوان دەیەوێ ئەو دیاردەشی بە هۆکار و فاکتەرێکی دی بەعەرەبکردنی کوردستان بزانێ؟ بۆچی هەر کوردستان؟ دەبێ نەهاتبن بۆ وڵاتی فارس و ڕۆم؟! ئەگەر ئەوانە بەناوی "داگیرکردن" و "عەرەبکردن" هاتبن، ئەوە دەبوو هەر گاڵ لەگەڵ کورد لە کێشەدا بووبان؟!**

---

١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مفید رائف محمود العابد: معالم تاریخ الدولە الساسانیە، عصر الاكاسرە ٢٢٦-٦٥١.

٢- بڕوانە خەسرۆ گۆران، کوردستان لە مێژوودا.

دیاردەی موسڵمانێتی کورد، مێژوویەکی نوێی بۆ کورد تۆمار کردووە، هەر هیچ نەبێ بەر لەوەی کورد موسڵمان بێ، بەشێکی زەردەشتی، بەشێکی ئاگر پەرست، بەشێکی مانی، بەشێکی مەزدەکی.. بەشێکیش گاور و بەشێکی (مەسیحی) بووە. هیچ کام لەم دینانەش (دینی قەومی) نەبوون وەك هەندێ بانگەشەی بۆ دەکەن، کوردستانیش بەشێکی لەدەست ساسانی (کە هەندێ ئەوانیش بەکورد دادەنێن!) [1]، بەشێکی لە دەست بێزەنتیان بوو، ئەو دوو دەسەڵاتەش چەندەها ساڵ بوو شەڕی یەکتریان دەکرد.. بەڵام ئیسلام زۆربەی هەرە زۆری کوردی بە ئیسلام ئاشنا کرد، کوردستانیش کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی خودی کورد.

ئەگەر ئیسلام، عەرەبایەتی بوایە، بۆچی دەسەڵاتی خێڵەکی عەرەبی، پێش کورد شەڕی "ئیسلام"یان دەکرد؟! لە راستیدا نەك هەر دەسەڵاتی عەرەبی شاریی، بەڵکو دەسەڵاتی خێڵەکی و ڕەوەندی عەرەبیش, باش لەوە حاڵی ببون، کە ئیسلام نەرێی (نەفی) دەسەڵاتی ناشەرعی ئەوان بەسەر مرۆڤەوە ڕەتدەکاتەوە.

هەر لەو پێودانگەوە، نەك هەر عەرەبی نیمچە دورگەی عەرەبی شەڕی ئیسلامیان کردووە، بەڵکو عەرەبی مەسیحی دەرەوەی نیمچە دورگەش،شەڕی ئیسلامیان کردووە، هەر کاك شوان خۆی لە لاپەڕە (١٥٣) لە بارەی گیرانی (تکریت) دەنووسێ:

"زۆر لە مێژوونوسان لەسەر ئەوە کۆکن، کە گیرانی تکریت لە ساڵی ١٦ك/٦٣٧ز دابووە، کاتێك هەواڵ گەیشت بە (سعد بن أبي وقاص)، کە خەڵکی موصڵ و کوردە شهارجەکان و هەندێ هۆزی عەرەب بە هاوەڵی سوپایەکی بێزەنطی

---

١- شاسوار هەرشەمی: مێژووی ئارامییەکان لە کوردستان، ل٣٩.

بە فەرماندەی (ئەنطاق) لە تکریت ئۆردوویان خستووە، سەعد نامەیەکی بۆ خەلیفە (عومەر) نارد و ئاگاداری کردەوە[١].

هەر لێرەوە دەکرێ ڕاستییەکی مەزن بوروژێنین، ئەویش ئەوەیە، کە ئیسلام بە هیچ جۆرێ دەمارگیری عەرەبی قەبوڵ نەکردوە، ئەوانەی لە دیدگای عەرەبایەتییەوە لە ئیسلام دەڕوانن، عەرەبایەتی بە ئیسلام دەبینن، تەواو لە ئیسلام نەگەیشتوون.

نکوڵی ناکرێ، کە هەندێ شۆفێنی عەرەب هەر ڕەخنەیەك لە "عەرەبایەتی" و "زمانی عەرەبی"، بە زەندیق و شعوبیەت لەقەڵەم دەدەن. هەروەها ڕەگەزی عەرەب و زمانی عەرەبی لە لایەك لە ئایین بەرزتر دەبینن، ئەوەتا (ساتع ئەلحەسەری) باوەڕی وایە، کە عەرەبایەتی لە ئایین بەهێز ترە و ڕەگێکی توندتری لە ئایین هەیە، پاساوەکەشی بۆ ڕایەکەی خۆی ئەوەیە، کە عەرەب هەر بە عەرەب مایەوە، هەر چەندە سێ دینی ئاسمانی جیهانی (جولەکایەتی، فەلایەتی، ئیسلام) لە دەڤەر و زێدی ئەوان سەری هەڵداوە، لە لایەکی دی کەسانی دی بەجۆرێکی تر، عەرەبایەتی بە "جەوهەری" ئیسلام دەبینن، بەزاری پێغەمبەر ﷺ بانگەشە دەکەن، کە عەرەب چاکەی بەسەر غەیرە عەرەبەوە هەیە بەوەی "پێغەمبەر ﷺ خۆی عەرەبە، قورئان بەعەرەبییە، زمانی ئەهلی بەهەشتیش عەرەبییە!"[٢] ئەمەش تەواو پێچەوانەی بنەماکانی ئیسلامە، پێغەمبەریش ﷺ هەر لە حەجیماڵئاوایی دەفەرموێ: "نە عەرەب فەزڵی بەسەر غەیرە عەرەبەوە هەیە، نە بەپێچەوانەش". کاك شوانیش،کە چەند ئایەتێ دەهێنێتەوە

١- شوان عوسمان، ل١٥٣.

٢- بروانە محمد سلام، شۆڤێنیەتی عەرەب لەمپەرە لەبەر دەم چارەسەری مەسەلەی کورد.

بەوەی قورئان بەزمانی عەرەبی دابەزیوە؛ هیچ لە ڕاستی ناگۆڕێ، بەڵێ قورئان بە زمانی عەرەبییە، بەڵام هەر لە قورئاندا هاتووە, کە بۆچی قورئان بە عەرەبی‌یە، لە ئایەتێکدا هاتووە: "...... لعلکم تعقلون"!! ئایا ئەمە بە فەزڵی عەرەب و عەرەبایەتی و پەسەندی عەرەب بەسەر غەیری عەرەب دێ؟!

هەر لێرەوە پرسیارێك لە کاك شوان دەکەم، ئەگەر گومانی بەرێزت لە جێی خۆی بێ، دەبوایە لە زەمەنی ناسیۆنالیزم دا عەرەب لە هەموو گەلانی دی ئیسلامی تر بوان؟! ئەرێ لەو (٢١) دەوڵەتە عەرەبییەی ئەمڕۆ کامەیان دژی "دەسەڵاتی ئیسلامی، دەوڵەتی ئیسلامی، شەریعەتی ئیسلامی، بیری ئیسلامی.." نییە؟! هەروەها کام لەم ڕێکخراوە ئیسلامیانەی لەو(٢١) دەوڵەتە ناسیۆنالیستەی وڵاتانی عەرەبی، دژی دەسەڵاتی ناسیۆنالیستی نادینی عەرەبی نییە؟! ئەرێ زیندانەکانی ئەو دەوڵەتانە لەسەدا نۆهەتی ئیسلامیی تێدا نییە؟!

لە چەرخی (ئەنتەرنێت) لۆژیك زۆر گرنگە، هەندێ شتی پێ شرۆڤە بکرێ، بەڵام چی دەکەی لەگەڵ عەقڵیەتی "بشفڕێ هەر بزنە"؟! ئەوەندەش دەڵێم: "عەقلیەتی نەعامەش" بەسەر چووە، عەقلیەتی "شەستەکانیش" بەسەر چوو، هەرچی بوترێ "بەچەپڵە" وەڵام بدرێتەوە؟! ئیسلام زۆر مەزنترە لەوەی لە بوتقەی "عەرەبایەتی" بچووك بکرێتەوە؟! شەرمە تێڕوانینی عەرەبی لە بەرامبەر تێڕوانینی ئیسلامی دا بنرێ؟! لە دەرەوە، بەسەدان توێژینەوە و کتێب لەسەر چەندەها لایەنی ئیسلام ئەنجامدەدرێ، ئەفسوس لە زانکۆیەکی وەك زانکۆی سلێمانی "ماستەر

نامەیەك" تەرخانبکرێ بۆ دیتنی ئیسلام لە عەرەبایەتی! بەڵام چی دەکەی ئەوە ئەو ڕۆژ هەڵاتەیە، کە ئەمڕۆ لەسەر هیچ نییە تەنیا چاولێکەری شتە سواوەکان و مردووەکان نەبێت.

لە جیهانی ئەمڕۆ باس لە کۆمەڵگەی مەدەنی و ململانێی ژیارەکان و گفتوگۆ و دایەلۆگی نێوان ژیارەکان و ئایینەکان دەکرێ.. هەر لە هەموو ئەو بابەتانە، ئیسلام چ لە ڕۆژئاوا, یان ڕۆژهەڵات بەشێکی هەرە گرنگی ئەو پرسە جیهانییانە داگیر دەکات؟!

# بابەتی سێیەم

# ڕەوشی ئایینی و سیاسی کورد پێش ئیسلام

## یەکەم: ڕەوشی ئایینی

یەکێ لە ئەدگارە هەرە کرێتەکانی نیمچە دورگەی عەرەب بتپەرستی بووە، بەڵام لە ژێدەرە مێژووییەکانەوە دەردەکەوێ، کە زۆربەی گەلانی کۆن بتپەرست بوونە، سەبارەت بە بتپەرستی کوردیش, کاك شوان دەنووسێ:

چەند بەڵگەیەکمان لە هەگبەی لاپەڕەکانی مێژوو لەبەر دەست دایە، (جرجیس) ناوێك دەبێتە پادشای موسڵ و خەڵکی دەڤەری جەزیرە بووە، پیاوێکی توند و تیژ و یاخی بووە، ئەم پادشایە بتپەرست بووە و خەڵکیشی ناچار کردووە، کە بت بپەرستن، هەروەها بتپەرستی لە شارەزووریش دا بوونی هەبووە[1] هەروەها (شەمەستانی) دەنووسێ، کە لە هەندێ دیاردەی سروشتی وەك خۆر، ئاگر و بروسك- بتیان بۆ دروست دەکرا و دەپەرستران!

ئەمە و (زرڤانی) و (میترایی) دوو دینی کۆنی دەڤەری ئێرانن، ژێدەرەکان ئاماژە بەوە دەکەن کورد، بەر لە زەردەشتییەت، لەسەر ئەو دوو دینە بوونە، هەتا هەندێ بۆ ئەوەی ئێزیدیاتی بکەنە دینێکی کۆنی کورد، ئەوە (میترایی) دەکەنە بنەمای ئێزیدیاتی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە کوردیش بەر لەوە یەکخوا بوو بن، چەند خوداوەندێکیان هەبووە و بتپەرست بوونە.. ئەمەش بەشێك بووە لە کەلتوری کۆنی کورد!

لە قورئاندا چەندەها ئایەت هەن باس لەوە دەکەن، کە خوای گەورە بۆ

---

١- شوان عوسمان، ل٩١.

**هەر نەتەوەیەك پێغەمبەرێكی بەزمانی خۆیان بۆ ناردوون[1]. بە واتای كوردیش وەك هەر نەتەوەیەكی دی پێغەمبەری خۆی هەبووە، بەڵام كێ بووە ئەمە پرسیارێكە وەڵامی ئاسان نی‌یە. ئەگەر بڵێین زەردەشت؟ كام زەردەشت؟ ئەریٚ (ئاوێستا) كتێبێكی پیرۆزی كوردی بووە؟! لەیەك نزیكی گەلانی وڵاتی ئاریان وەك كورد، فارس، ئەخمینی، ئەشكانی، فیرسی.. لە لایەك، لە لایەكی تر بە حوكمی ئەوەی ئەم گەلانە هەموو لە قۆناغێكی ژیانیاندا زەردەشتی بوونە، بۆیە حوكمی یەكلاكەرەوە ئاسان نیە. ناتوانین بڵێین زەردەشت پێغەمبەرێكی نەتەوەیی كورد بووە؟! هەر لە ڕوانگەی ڕوداوەكانی مێژووییەوە، ناكریٚ بڵێین ئەخمینی و فیرسی و ساسانی هەموو كورد بوونە؟! ئەمە تەنها چەند ئاماژەیەكن و چی تر نەء، هەروەها دەروازەیەكن بۆ زیاتر تێگەیشتن لە رەوشی ئایینی كورد پێش ئیسلام.**

**لە پاش زرڤانیەت و میترایی، زەردەشتیەت لەناو كورد پەیدابووە.**

**زۆر لە سەرچاوەكان جەخت لەسەر ئەوە دەكەن، كە زەردەشت لە دەڤەری ورمیٚ لە دایك بووە، ورمیٚ بەشێكی كوردستانە، ئەو زەردەشتەش گەر كورد بیٚ، واتای ئەوە نا گەیەنیٚ، كە كورد لە ڕێگای زەردەشت خۆیەوە بوونەتە زەردەشتی، چونكە هەر ژێدەرەكان دەڵێن، كە خەڵكی دەڤەرەكە وایان لە زەردەشت كردووە دەڤەرەكە بەجیٚ بهێڵی»[2]. ناكریٚ**

---

١- وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً "(النحل٣٦) هەروەها "وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ "(ابراهیم-٤).

٢- كورد گەلێكی چیایی و شوانكار و پیشەی مەڕ و ماڵات بەخێوكەر بوونە، بۆیە بایەخێكی ئەوتۆیان بە زەردەشتیەت نەداوە و لەسەر ژیانی جارانی خۆیان بەردەوام بوون، لە نەزەری خودی زەردەشت ئەمانە دێو پەرست بوونە، بڕوانە د.ڕەشاد میران، ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە كوردستاندا، ل٢٦.

نکـولّی لــەوە بکــریّ، کــە زەردەشــتیەت ئــاینێکی ئاسمــانی بــووە و زەردەشـتیش پێغەمبـەر بـووە، هـەروەها بـەحوکمی ئـەوەی زەردەشـتیەت "ئاگر"ی بەشتێکی پیرۆز دەزانـیّ، ئەو پیرۆز و تەقدیسە لە پاشان بۆتـە جۆرێك لە پەرستن. هەروەها ساسانیەکان بەتایبەتی لە سەردەمی شابوری دووەم (٣٠٩-٣٧٩ز)دا هەندیّ گۆڕانکاری لە زەردەشتیدا کرد و بڕیاریـدا ئاینـە کۆنـەکانیش -بـت بەرسـتی-، کـە خـەڵکی لادیّ و چیانـشینەکان پـەیڕەویان دەکـرد، لـەخۆ بگرێـت[1]. بەمجۆرە پـەیتا پـەیتا زەردەشـتیەت ئاسمانیـەتی خـۆی لەدەسـت دا، بـووە بەشـێك لـە دەسـەڵاتی شـاکانی ساسـانی و پیـاوانی ئـاینی، یـاخود مۆغـەکان. بـەڕای مـن لێـرەوە زەردەشتیەت گۆڕدرا بوو بە "ئاگر پەرستی" مەجوسی، نەك زەردەشتیەت خۆی مەجوسیەت بیّ!!!

بەواتایـەکی دی زەردەشـتیەت ئـاینێکی ئاسمـانی بـووە، هەرچـی "مەجوسیەتە" ئاینێکی مرۆڤکردەی دەسەڵاتی ساسانی بوو!

لە کاتی وڵاتگیری ئیسلامیدا, کورد، نە دەوڵەتی مابوو، نە ئاینی خۆی مـابوو، ئـەوەی هـەبوو مەجوسیەت بوو، نـەك زەردەشـتی. هـەر کـاك شـوان خـۆی لـە چـەند ژێدەرێکـەوە بـاس لـەوە دەکـات، کـە چـەندەها ئـاگردانی زەردەشـتی لـە دەڤـەری کـوردی هەبوونـە، هـەر بـۆ نموونـە، دەنووسـیّ: ئاگردانێك لە دەشتی شارەزور دۆزرایەوە[2]. لە ئوستـانێکی (هەمـەدان) رسـتاقی (فـەرهان)- دوو ئـاگردانی گـەورەی زەردەشـتی لیّ بـووە، پاشماوەیـەکی ئـاگردانێکی زەردەشـتی لـە شـاری (کـەنگاور)، هـەروەها شـاری (ئەشـتر)

---

١- شوان عوسمان، ل١٠٥ ئەویش لە کریستنسن، ول دیورانت و ڕەشاد میران وەریگرتوە.

٢- شوان عوسمان، ل١٠٠

ئاگردانێکی زەردەشتی لێبووە[1]، ئەمە و هەتا ئاگردانی مەجوسەکان لە هەولێریش هەبووە. یاقوتی حەمەوی شیعرێکی هەجوی عبدالرحمن بن مستخلف- ناوێکی نووسیوە، کە دەلالەت لەسەر ئاگردانی زەردەشتی دەکات لە هەولێر:

اربل دار الفسق حقا، فلا
یعتمد العاقل تعزیزها
لو لم یکن دار فسوق لما
اصبح بیت النار دهلیزها[2]

ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی، کە سوپای ئیسلام هاتۆتە کوردستان، کورد لە ژێر دەسەڵاتی ساسانی لەسەر دینی ڕەسمی دەوڵەت بوونە. بەواتای مەجوسی ئاگر پەرست بوونە، نەك زەردەشتی خودا پەرست، لەگەڵ ئەوەشدا خەلیفەی ئیسلام عومەری کوڕی خەتاب داوای لە سەرکردەکانی موسڵمانان کردووە,, کە مامەڵەی "ئەهلی کیتاب"یان لەگەڵدا بکری"[3].

لە بەرامبەر ئەو گۆڕانکاریەدا دوو بزاڤی ئایینی -ریفرۆمی- چاککاری لە زەردەشتیەت سەریان هەڵدا، (مانەویەت) یەکێ لەو بزاڤانە بوو،کە چیتر بە بنەماکانی زەردەشتیەت رازی نەبوو، دامەزرێنەری بزاڤەکە (مانی فتك) کە پێشتر بنەماڵەکەی لەسەر رێبازی (مغتسله) بوون، بەلام (مانی) خۆی

١- شوان عوسمان، ل١٠٠
٢- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
٣- کارل بروکلمان، تاریخ الشعوب الاسلامیە، ل٧٩.

ببــوە زەردەشــتی[١]. ئــەو زەردەشــتییەی ساســانیەکان و مۆغــەکان بانگەشــەیان بــۆ دەکــرد، وەڵامــی پرســیارەکانی کەســانی وەك (مــانی) نەدەدایەوە، بۆیە مانی بزاڤێکی بەناوی خۆی بەرپا کرد، شەنگستەکانی رێبازەکەی "تێکەڵ" بوو لە زەردەشتیەت ومەسیحیەت و بوزیەت، (مانی) بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە ئەو "مەسیحی ڕەسەنە"[٢] و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە مەسیحیەت زۆر کاری لە رێبازەکەی کردووە، هەتا ئەویش باوەڕی بە "باوەڕی سێیانە- عقیدە التثلیث" هەبوو، (شابور) بەرگەی ڕایەکانی (مانی) نەگرت و دەسگیری کرد و لە دەڤەری دەوڵەتی ساسانی دووری خستەوە. ئەمە وەنەبێ ڕۆمە مەسیحیەکانی دەڤەری جەزیرەش بەرگەی مانەویەتیان گرتبێ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەگەری ئەوەی، کە زەردەشتیەت و مەسیحیەت، ئەوسا دوو دینی ڕەسمی دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمی بوون.

بەرگەی هیچ دینێکی نەدەگرت، لە ئاکام لە سەردەمی بەهرامی برای هرمــزی کــوڕی شــاپور، مۆغــەکانی زەردەشــتی دەرفــەتیان وەرگــرت و فەتوایان دا، کە (مانی) زەندیقە، ئەو تۆمەتە بەس بوو بۆ مۆغەکان، کە سەری (مانی) بە حەلال بزانن، ئاکامیش هەروا کەوتەوە، ساسانیەکان بەقسەی مۆغەکان (مانی) یان گرت و تێر ئازاریان دا و لە کۆتاییدا کوشتیان و هەڵیانواسی[٣].

١- کلثومة جمیل، الحیاه الدینیه و الاجتماعیه و الاقتصادیه لبلاد الکرد فی عهد الساسانیین ٢٢٤-٦٣٠، ص٣٠.

2-10-Goring,dictionary of belefs and Religion, p.319

٣- شوان عوسمان، ل١٠٨.

لەسەر دەمی شا قوبادی یەکەم (٤٨٨-٥٣١ز) دەسەڵاتی مۆغەکان لە نێو دام و دەزگای ساسانیەکاندا زۆر بەهێز ببو، زیاتر لە دوو سەدە بوو بزاڤێکی دی لە دەڤەرەکە لە دژی دەسەڵاتی مۆغەکان بەرپا نەببو، ئەمە و هەندێ ژێدەر ئاماژە بەوە دەکەن، هەتا دەسەڵاتی ساسانی ترسی لە دەسەڵاتی مۆغەکان هەبووە[1] . دەسەڵاتی مۆغەکان، کە هەم ببوە دەسەڵاتێکی سیاسیش، ڕێی بە هیچ گۆڕانێك لە سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری نەدەدا، وەك بڵێی دەوڵەتی ساسانی ببوە "دەوڵەتێکی ئایینی"!

لە سەردەمی شا قوباد (قوباد لە هەندێ سەرچاوەدا) مەزدەك جاڕی بزاڤێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی دا، بنەماکانی ڕێبازەکەی تەواوی تەختی ساسانی دەهەژاند، بزاڤەکە بە قەولی ئەمڕۆ جۆرێك لە کۆمۆنیستی بوو، دژی چینایەتی بوو، باوەڕی وابوو، دەبێ مرۆڤ لە هەموو شتێ هاوبەش بن، هەروەك چۆن لە ئاو وهەوا هاوبەشن،لە ژن و ماڵیش دەبێ هاوبەش بن[2] .

لە بەرامبەر ئەو بزاڤەدا (مۆغەکان) کەوتنە خۆ، کە ئەو بزاڤەش بە دەردی مانەویەت ببەن، سەبارەت بە لە ناوبردنی (مەزدەك) دوو ڕای پێچەوانە هەیە، کریستنسن باوەڕی وایە، کە هەر لەسەردەمی قوبادی یەکەم دا نەوشێروانی جێنشینی قوباد، کە هەستی کردووە دەسەڵاتی کەوتۆتە خەتەر، لە کۆتایی ٥٢٨ز یان بەرایی ٥٢٩ مەزدەکیەکان، کە

---

١- أحمد عادل، الطريق إلى المدائن، ص١٠٨-١١٠ پیاوانی ئایینی چینی سێیەمی دەسەڵاتی دەوڵەتی ساسانی بوون.

٢- الشهرستاني، الملل و النحل،ج٢،ص٨٧.

دەیانویست (کاوس) بکەنە جێنشینی دەوڵەت و (کسرا) لا بدەن، بۆیە بە سەرۆکایەتی قوباد کۆنگرەیەکی ئایینیان ئامادەکرد و زۆربەی گەورە پیاوانی مەزدەکیەت و مەجوسیەت ئامادە بوون، هەروەها (بازیان)ی ئەسقەفی مەسیحیەکانی ئێرانیش ئامادە بوو، ئەویش دژی مەزدەکیەت بوو، لەو کۆنگرەیەدا بە قسەی نەوشیروان مەزدەکیان کوشتووە[1]، هەرچی (إبن الاثیر)ە باوەڕی وایە مەزدەك لە سەردەمی نەوشیروان کوژراوە، نەك لە سەردەمی قوباد[2] لە ئاکامیش هەر نەوشیروان بەسەر لایەنگرانی مەزدەك لە دەڤەری خۆی زاڵ بووە[3].

هەر لەسەردەمی ساسانیەکاندا (٢٢٤-٦٣٧) جولەکایەتی و فەلایەتی هەبوون.

سەبارەت بە جولەکایەتی لە وڵاتی کوردان زۆر ڕا هەن، کە لەسەردەمی ئەمپراتۆریەتی بابلی نویێ-ەوە جولەکە ڕەوانەی کوردستان کراون. هەروەها ڕایەك هەیە، کە لە سەردەمی (میدیا)، جولەکە لە کوردستان هەبوونە، هەتا باوەڕێ هەیە کە زەردەشتیەت لە ڕووی یەکخواییەوە سودی لە "جولەکایەتی" بینیبێ. بەواتای شەنگستی یەکخوایی زەردەشتیەت لەسەر یەکخوایی جولەکایەتی بونیاد نراوە.هەروەها دەگوترێ ئەوەی جولەکە بە خوایی تێدەگەن زۆر جودایە لە هی زەردەشتیەت!!!!

بە حوکمی ئەوەی جولەکایەتی ئاینێکی ئەتنیکی -نەتەوەیی بووە،

---

١- کریستنسن:ایران، ص٣٤٦-٣٤٧.

٢- لطبری: تاریخ الطبري،ج٢، ص٥٨، الشهرستاني:الملل و النحل،ج٢،ص٨٦.

٣- ابن الاثیر: الکامل،ج١،ص٢٧٣، کلثومە،ص٣٨.

نەك تەبشیری. بۆیە بە بەراورد لەگەڵ مانەویەت و مەزدەکیەت، جێگای ترس نەبووە بۆ مۆغەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شاکانی ساسانی و مۆغەکان، یەك سیاسەتیان لەسەر جولەکایەتی نەبووە. ئەردەشێری دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانی رێی بە مەجوسەکان دا، کە ئازاری جولەکەکانی دەڤەرەکەی بدەن، چونکە ئەو جولەکانە یارمەتی "ڤیرسی" یەکانیان داوە لە دژی ئەردەشێر.

هەرچی یەزد گوردی دووەم بوو لە ساڵی (٤٥٤) رێی بە جولەکان نەدا لە رۆژی "شەممە" خودا پەرستی بکەن، هەرچی قوبادی یەکەم بوو (مارزوترا)ی حاخامی جولەکان و هەندێ لە مامۆستایانی کتێبی جولەکەیانی زیندانی کردن و، لە پاشان هەمووی کوشتن[1].

لە بارەی گاورەکانی کوردستان یاخود فەلایەتی، لە ئینجیلی مەتی دا هاتووە، کە کۆمەڵێ مەجوسی لە سەردەمی شا هیرودیس دا بەرەو فەڵەستین چوونە، چونکە باوەڕیان وابووە عیسا پێغەمبەر، لە فەلەستین لە بەرەی جولەکان لە دایك دەبێ، ئەو کۆمەڵە مەجوسە (پیاوانی زەردەشتی) عیسا پێغەمبەر و مەریەمی دایکیان بینیوە و باوەڕیان پێهێناوە[2].

هەروەها سەرکیس ئاغا جان لەم بارەیەوە دەنووسێ: "لە ساڵی (٣٥)ی زاییندا (تۆما)، کە یەکێك بووە لە دوازدە نێرراوەکەی حەزرەتی مەسیح، لەسەر رێگای خۆیدا بۆ (هیندستان) سەری لە خەڵکی (ماد) داوە و پەیامی حەزرەتی مەسیحی بە خەڵکەکە ڕاگەیاندووە. هەروەها (ماری) کە پاتریارکی کەنیسەی ڕۆژهەڵات بوو، لە ساڵی (٣٥-٤٩)ی زایینی، لەگەڵ

---

١- إبن الاثیر، الکامل،ج١،ص٢٧٣،کلثومة،ص٣٨.

٢- الکتاب المقدس، العهد الجدید، اصحاح متی، ص٥.

چەند کەسێك مزگێنی پەیامی حەزرەتی مەسیحی گەیاندووەتە شاری (اربل) واتە (هەولێری ئێستا) و ناوچەکانی دەوروبەری زێی گەورەوە و[1]

بە گوێرەی ئینجیل و ڕای هەندێ نوسەری مەسیحی، کورد یەکەم نەتەوەن، کە هەر لە بەرایی ڕاگەیاندنی فەلایەتیدا باوەڕیان بەو دینە نوێیە هێناوە[2].

هەروەها کوردەکان لە شاری هەولێر میرنشینی ئەدیابییان دامەزراندوە.

لەسەردەمی ساسانیەکاندا، فەلایەتی لە هەندێ بەشی ژێر دەسەلاتی ساسانی لەناو کوردان بلاوبۆتەوە، ئەدی شێر دەنووسێ: لەسەردەمی دەقیانوس (٣٠٣-٣١١) فەلەی غەیرە کورد هاتونەتە دەڤەری کوردی[3]. ئەوساش دوو زلهێز لە گۆڕەپانەکە هەبوون: دەوڵەتی ساسانی، کە مەجوسیەت دینی ڕەسمی دەوڵەت بوو، دەوڵەتی بێزەنتی کە لە پاش مەسیحی بوونی قوستەنتین، وەك زەردەشتیەت یەکخواپەرستی خۆی لە دەستدا و، لەپاشان بووە دینی ڕەسمی دەوڵەتی بێزەنتی. هەروەها ڕای تر هەیە کە وەك طبری دەنووسێ: کاتێ شابور هەندێ لە وڵاتی ڕۆمی داگیر کرد، هەندێ دیلی فەلەی لەگەڵ سوپاکەی خۆی بۆ دەڤەرەکەی هێنا، ئەمانە وازیان لە دینی خۆیان نەهێنا، بەڵکو هەر لەسەر دینی خۆیان بەردەوام بوون[4]، کورد لەسەردەمی ساسانیەکاندا ، کە وڵاتیان بۆ

---

١- سرکیس ئاغاجان، کوردە مەسیحیەکانی سەردەمی ساسانی، ل٥.

٢- سەرچاوەی پێشوو.

٣- ادی شیرە تاریخ کلمد و اشور،ج٢.

٤- بروانە طبری و إبن الاثیر و إبن الکثیر.

دوو بەشی سەرەکی دابەشکرا: ئەقلیم جیبال، ئەو بەشە لەژێر دەستی ساسانیەکاندا دابوو، کورد دەبوو لەو دەڤەرە (مەجوسی) بن، چونکە دینی رەسمی دەوڵەت بوو، ئەمەو پاشماوەی مانەوەی مەزدەکیش لێرە و لەوێ هەبووە، هەتا مەسیحیەتیش هەبووە. هەرچی بەشی ئەقلیمی جزیرەیە، هەردەم ململانێی لەسەر بووە، بەڵام بەزۆریی مەسیحی بوونە، چونکە مەسیحیەت دینی رەسمی دەوڵەت بووە[1].

لە نێوان مۆغەکان و پیاوانی فەلە ئاریشەی زۆر هەبوون. مۆغەکان لە غەیری خۆیان هیچی تریان قەبوڵ نەبوو، هەرچی مەسیحیەت بوو. دینێکی (تەبشیری) بوو، ئەمەش وەك مانەوەی مەزدەکی، کورسی دەسەڵاتی مۆغەکانی دەهەژاند، بۆیە لێرە و لەوێ مەسیحیەکان کەوتنە بەر هێرشی دڕندانەی مەجوسەکان؛ هەر تەنها شابوری دووەم لە ساڵی ٣٤١ هەتا ٣٧٩ کەوتە چەوساندنەوەی مەسیحیەکان و هەتا نەمرد وازی لێ نەهێنان. ئەمەش لە مێژوودا بە "چەوساندنەوەی چلی" بەناوبانگە[1].

سرکیس ئاغاجان لە نامیلکەی "کوردە مەسیحیەکان لەسەردەمی ساسانیەکان دا" باس لە چەندەها هەڵوێستی دڕندانەی پیاوانی زەردەشتی لە مەڕ مەسیحیەکان دەکات، لە لاپەڕە (٨هەتا ١٤) باس لە هەندێ "پیاوە مەزنەکانی کورد لە ئایینی مەسیحیەکاندا" دەکات وەك: (مارپتیۆن، ماریاسا، عەبد یشوع، بارسوما، مارقەرەداغ.." ئەم پیاوانە زۆر بەدەست مەجوسەوە ئازار دراون و هەندێکیشیان کوژراون[2].

هەروەها چەندەها پیاوانی دی دینی کوردی مەسیحی بەدەست

---

١- ادی شیر، ص٦٥، کریستنسن، ص٢٥٤.

٢- مارپتیۆن و مار قەرەداغ کوژراون و چەندانی تر.

مۆغەکان کوژراون، وەك: ئەسقەفی شارەزوور، کە لە ساڵی (٦٠٤) دارا شا کوشتی[1].

لەم چەند دێرە دەفامرێتەوە، کە نەك هەر کوردستان، بەڵکو تەواوی دەڤەرەکە لە ململانێیەکی ئایینی و سیاسی توند دا بووە، هیچ کام لەم دینانە بەهانای کورد نەهاتوون.

ساسانی و کورد هەردووك، زەردەشتی لە پاشان مەجوسی بوونە، بەڵام هەر کورد چەوساوە و ژێر دەستە بووە، هەرچی ساسانیەکانیش بوون سەر دەستە بوونە!

کەوابێ لێرە "ئەگەری دین" نەبۆتە هۆی ئەوەی کوردیش هەر لەساڵی ٢٢٤-٦٣٧ دەسەڵاتێکی سیاسی هەبێ لە دەوڵەتی ساسانیدا! ئەمە و کە کورد بەشداری لە بزاڤی مانەوەی مەزدەکی دا کردووە، باجی خۆی داوە، ساسانیەکان و پیاوانی ئایینی زەردەشتی و مەجوسی، کە ئامادەبن مانی و مەزدەك بکوژن، پیاوانی مانی و مەزدەکی کوردی؛ هەر دەکوژن؟!

هەروەها فاکتەری دینی لە دەڤەری ژێر دەسەڵاتی بیزەنتیش بەهانای کورد نەهاتووە، کوردی دەڤەری جەزیرە زۆربەی "مەسیحی" بوونە و رۆمەکانیش بیزەنتی بوونە، بەڵام هیچ رۆڵێکی سیاسی نەبووە، ئەگەر زانای کوردیش لە مەسیحیەت دا هەبووبێ ؟! کە ساسانیەکان و مەجوسیەکان، مەسیحیەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان ئازار دابێ و کوشت بێ، لە بەرامبەر رۆمەکانیش، کوردە زەردەشتیەکانی ژێر دەستی خۆیان ئازار داوە و کوشتووە!

لە لایەکی تر، کورد لە بەرایی بتپەرست بووە، لە پاشان زەردەشتی،

---

١- مؤلف مجهول: التاريخ الصغير للقرن السابع الميلادي، ص٦٩، شوان عوسمان ل١٢١-١٢٢

ئاگر پەرست، مانەوی، مەزدەکی مەسیحی بووە، ئەو هەموو دینانەش لەگەڵ هاتنی ئیسلام مۆرکە ئاسمانییەکەیان لە دەست دابوو. بوونی ئەو هەموو ئاگردانە و پەرستگایانە، ئاگر پەرستێتی کورد دەگەیەنێ، نەك خودا پەرستی. لەوانەیە مۆغەکانیش هەروەك قورەیشیەکان بڵێن: ئێمە ئەوانە نا پەرستین، بەڵکو بۆ تەنها نزیکبوونەوە لە زاتی خوایە؟!

هەرچی سێکوچکەی پەرستنی فەلایەتییە؛ حاڵەتێکی دی هەڵوەشاندنەوەی ئینجیلی یەزدانییە، کە بۆ عیسا پێغەمبەر هاتووە، بۆیە بە هەموو لۆژیکێك مرۆڤایەتی چاوەڕێی رەحمەتێکی دی خوایی بوو، بە واتای هاتنی ئیسلام زەرورەتێکی مێژوویی بوو بۆ مرۆڤایەتی.

کاك شوان دەنووسێ: "ئیسلام لە زۆر لایەنەوە نامۆ بوو بە پێکهاتەی کولتووری و گیانیی کۆمەڵگای کوردی" نازانم لە چ ڕوانگەیەك؟! بەڵێ پێکهاتەی کولتووری و گیانی کۆمەڵگای کوردی بتپەرستی و لە پاشان ئاگرپەرستی بووە. ئەو پێکهاتەش بە هیچ جۆرێ لەگەڵ ئیسلام ناسازێ، نەك وەك کاك شوان گومانی وایە، کە ئیسلام هۆڤانیەتە، پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردیش خوداپەرستی و تەناهییە!!

ئیسلام لەگەڵ مەجوسیەت و مانی و مەزدەکی و جولەکایەتی و فەلایەتی هەڵوێستی نەرم بووە، هەمووی بە ئەهلی کیتاب لە قەڵەم داون و ئەوانەی لەناو قەڵەمڕەوی خەلافەتی ئیسلامیدا بوونە، وەك "ئەهلی زمە" مامەڵەیان دەگەڵ کراوە، لەپاشانیش زۆربەیان موسڵمان بوونە، ئەوانی تر لەسەر دینی خۆیان ماونەتەوە.

هەر کاك شوان خۆی لە چەند جێیەك ئاماژە بەوە دەکات، کە لە پاش هاتنی سوپای ئیسلامیش بۆ دەڤەرەکە، مەجوسی و مانی و مەزدەکی و جولەکە و فەلە لە هەندێ شوێن، هەر لەسەر دینی خۆیان ماون، یاخود

هەر بە ڕواڵەت موسڵمان بوونە.

لە لاپەڕە (١٠٠-١٠١) کاك شوان دەنووسێ:

" لە شارەزووریش ئایینی زەردەشتی تیادا بڵاوبۆتەوە، کـە لەسـەدەی حەوتـەمی کۆچی/ سیانزەهەمی زایینی ناویان هاتووە. هەروەها ئایینی زەردەشتی لـە ئـاکرێ، تا سەدەی چوارەمی کۆچی، واتە دەیەمی زایینی بوونی هەبووە و تەنانەت سـەرۆکی ئاینیشیان هەبوە و ناوی (پیر ئەنۆ) بووە، کە لـە (شـوش) دانیـشتووە، لـە سـەدەی پێنجی کۆچی/یانزەهەمی زایینی لە شاری (ئەرزن) زەردەشتی لێبووە...

لە لاپەڕە (١١٢) دەنووسێ:

"تەنانەت لە دوای هاتنی ئیسلام و لەسەردەمی خەلافەتی ئەمەوی ٤٠-١٣٢ ك پاشماوەی مەزدەکیـەت لـەناو گـەلانی ئێـران هـەرمابوو... لە لاپـەڕە (١٢٤)یـش دەنووسێ: خەڵکی خۆزستان ، تا دوای هاتنی ئیسلامیش لەسەر ئایینی خۆیان — مەسیحیەت- بەردەوام بوون".

هـەروەها وەك بەڵگەیـەکی دی مێـژوویی لەسـەر لێبـووردەیی ئیـسلام لەهەمبەر دینەکانی تر، مانەوەی مەسیحیەکانی کوردستانە لەسەر دینـی خۆیـان هـەتا ڕۆژگـاری ئـەمڕۆ، ئـەرێ ئیسلام دینـی لێ بوردە و تـەناهی و پێکەوە ژیان نیە؟!

بێگومان گەر ئیسلام وا نەبوایە، دەبوو ئێـستا مەسیحیەك و ئێزیدیـەك و ئەهلی هەقەیەك لە کوردستان نەمابوایە؟!

ئەگەر بەڵگەی مێژوویی دادی هەندێ کەس نادات، دەبا لۆژیك دادی بداتن؟!



## دووەم: ڕەوشی سیاسی کورد

### ١/ ڕەوشی سیاسی کورد  پێش ئیسلام:

پێش ئیسلام، کورد لە ساڵی (٧٠٠ پێش زایینی) لە ڕووی سیاسی و کەلتورییەوە، شکۆیەکی مەزنی بۆ خۆی تۆمار کردووە، ئەو شکۆیەش دامەزراندنی دەوڵەتی (میدیا)، یاخود ماد بوو، دایاکۆ پاشا دامەزرێنەری ئەو دەوڵەتە بوو.

ئەو ساڵە سەرەتای ڕزگاری کورد بوو لە دەست بێگانە، ئەو دەوڵەتە سەرەتای دەرکەوتنی لایەنی ژیاریی و مەدەنی کورد بوو، لە ڕووی سەربازیشەوە، هێندە بەهێز بوو، کە توانیویەتی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری لە ناو ببا، هەروەها فارسەکان ناچار بکات دان بەدەسەڵاتی میدیاکان بنێن. هەر چەندە فارسەکان لە نێو قەڵەمڕەوی میدیا دا بوون، هەتا دوا پادشای (ماد)، کە ناوی (ئاستیاگ هواخشتەر) بوو، کچێکی خۆی دابووە میرێکی ئەخمینی فارسی؛ بۆ ئەوەی فارسەکان زیاتر گوێڕایەڵی پادشای میدی بن، بەڵام "دەسەڵاتی فارسی" لە دەرفەتێك دەگەڕا دەسەڵاتی میدی بڕوخێنێ، لە ئاکام لە دەوروبەری ساڵی (٥٥٠ی پ.ز) لە ئاکامی کودەتای (هارپاك)ی سەر لەشکری ماد لە دژی (ئاستیاگ پاشا) ئەکباتانی، پایتەختی میدیا پشێوی و سەر بزێوی سیاسی گرنگی تێکەوت، کودەتای (هارپاك) و دەست و پێوەندەکەی هەرەسی هێنا، کۆرشی دووەمی ئەخمینی بەهانای هارپاك هات و لە ساڵی (٥٤٩ی پ.ز) توانیان ئاستیاگ پادشا بکوژن[1].بە کوژرانی ئاستیاگ پادشا، دەسەڵاتی کوردی،

---

١- خەسرۆ گۆران: کوردستان لە مێژوودا، ل٨٦.

کەلتوری کوردی کەوتە بەر هەڕەشەی نەمان، هەروەها گۆڕانێکی بنەڕەتی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کوردیش ڕوویدا، ناچار بوو لە شار دەربچێ و ژیانی کۆچەری، یاخود کۆیلەیی بژی.

ئەخمینییە فارسەکان هەر بەڕوخانی دەسەڵاتی سیاسی کورد رانەوەستان، بەڵکو پێشڕەویان کرد بۆ هەموو بەشەکانی کوردستان، هەر لەسەردەمی دارای یەکەم (٥٢١-٤٨٦ پ ن) توانیان دەست بەسەر چیاکانی کورد دابگرن، هەتا هەرێمی جەزیرەش بگرن[١]. ئەمەو شەڕی دارای سێیەم و ئەسکەندەری مەکدۆنی، نەگبەتیەکی دی گەورەی بەسەر رەوشی سیاسی و کەلتوری کورد هێنا: فارس دەسەڵاتی کوردی لە ساڵی (٥٥٠ پ.ن)دا ڕوخاند، بەڵام مەکدۆنیەکان سەقافەت و ئاسەواری کوردیان لە ساڵی (٣٥٦ی پ.ن) سوتاند[٢]. لوتارك مێژوونووسی یۆنانی، کە لە پێش زایندا ژیاوە دەڵێت : (هیرۆ ستداتۆس) ئەو پیاوە یۆنانییە بوو، کە لە ساڵی (٣٥٦ی پ.ن) دا بۆ ئەوەی ناوبانگ دەربکات، پەرستگا نایابەکەی (ئەرتیمیری) سوتاند لە شاری (ئیفس) لە ئاسیای بچوك (کوردستانی باکور)، ئەو پەرستگایە، بە یەکێك لە حەوت شتە سەیرەکانی جیهان دەژمێردرا.

ئەسکەندەر خۆیشی لە ساڵی (٣٣٢) لە پاش شەڕی (ئەربێلا) لە هەولێر لەشکری دارای شکاند و بەرەو هەمەدانی پایتەخت چوو، لە تۆڵەی ڕەفتارەکانی ئەخمینیەکاندا، ئەسکەندەر بۆ ئەوەی ئەوەی پەیوەندی بە کەلتوری ئێرانی (فارسی-کوردی) هەیە نەهێڵێ، کتێبخانە

---

١- شوان عوسمان، ل١٢٨.

٢- حسن محمود کریم: ئاینی کورد، ل١٩.

مەزنەکەی (دیاریەکر)ی کوردستانی سوتاند، کە سەدان هەزار بەرگ لە دەسنووس و ئاسەواری رۆشنبیری و شارستانی کوردی تیابوو[1]. ئەمە و هەتا (ئاوێستا)ش لە هۆڤانیەتی ئەسکەندەر و یۆنانییەکان رزگاری نەبوو، دوو دانە ئاوێستا هەبوو، دانەیەك ئەسکەندەر سوتاندی، دانەیەکیش یۆنانییەکان بۆ خۆیان بردیان.

ئەسکەندەر هەر بەوەندە نەوەستا، بەڵکو زمانی یۆنانی کرد بە زمانی هەموو ناوچەکانی ئەمپراتۆریەت و فەرمانی کرد، کە (٧٠٠) شار دروست بکرێ، نەك تەنیا وەکو ئوردوخانە، بەڵکو وەکو بنکە و مەڵبەندی بڵاوکردنەوەی شارستانیەتی یۆنانیش[٢].

لە سەردەمی (سلوکی)یەکان و پارثەکان– فیرثییەکان، جارێکی تر کوردستان کەوتەوە ململانێی زلهێزەکانی ئەوسا، ئەمەو ئەگەر کورد لە هەندێ شوێن بەشێك بوبێ لە سوپای ئەو دەسەڵاتانە، لە هەندێ شوێن شەڕی ئەو دەسەڵاتانەی کردووە، لە ساڵی (٣٣٢ی پ.ز) هەتا دامەزراندنی دەسەڵاتی ساسانی لە (٢٢٤ی پ.ز) و دەسەڵاتی رۆمانی (٣٣٠ی پ.ز)، کوردستان ببوە شەڕگە و ململانێ و چەوساندنەوەی ئایینی و کەلتوری، ئەتنیکی.

بە حوکمی ئەوەی ئەم نووسینەی ئێمە زیاتر تایبەتە بە رەوشی سیاسی کورد لە سەردەمی ساسانی و رۆمانی دا، بۆیە چی تر لەسەر ماوەی پێش ئەو دوو دەسەڵاتە نادوێین.

---

٣- سەرچاوەی پێشوو.

١- خەسرۆ گۆران، ل١٠٧

## ٢/ ڕەوشی سیاسی کورد

## لە دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمانیدا :

لە "تاریخ الرسل و الملوك" و "الكامل في التاريخ" هاتووە، کە ئەردەشێری پاپکانی، یاخود بابەکی لە چارەگی یەکەمی سەدەی سێی زایینی دەسەڵاتی سیاسی و عەسکەری پەیداکردووە، بۆیە داوای لە ئەردەوانی پێنجەم، یاخود (ئەرتابانوس ٢١٦-٢٢٤) دوا پادشای فیرثی‌یەکان کردووە، کە ملکەچی دەسەڵاتی وی بێ، ئەویش لە وەڵامدا بە ئەردەشێری گوتووە:

"ئەی کوردی گەورەبووی دەواری کوردان، کێ ڕێگای پێدای تاج لەسەر نێی.." "ئەی کوردی گەورەبووی دەواری کوردان"، وای لە هەندێ نوسەری کورد و غەیرە کورد کردووە، کە ئەردەشێری بابەکی دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانی بە کورد بزانن[1]؟! بەکورد زانینی ئەردەشێر ئامانجێکی سیاسی لە پشتەوەیە. بێگومان ئەگەر "ئەردەشێر" کورد بووبێ، مەسەلەکە لە بەرژەوەندی ڕەوتی عەلمانی کورد دایە، چونکە ئەوان لە بەڵگەیەکی وا دەگەڕێن بۆ ئەوەی بانگەشەی ئەوە بکەن، کە ئیسلام یەکەم دەوڵەتی کوردی ڕوخاندوە و ئاوێستای سوتاندوە!! مەسەلەی سوتاندنی ئاوێستا لە لایەن ئەسکەندەری مەکدۆنی و بردنی دانەکەی تر لە لایەن یۆنانییەکان؛ هەموو سەرچاوەکان ئەوە دەسەلمێنن، بۆیە چیتر لەمە نادوێین، بەڵام ئەوەی گرنگە ساسانیەکانن، دەبێ کورد بن، یان فارس؟!

لە ڕووی نەژادەوە هیچ ژێدەرێك باسی ئەوە ناکات، کە ئەردەشێر کورد

١- بڕوانە شاسوار هەرشەمی: مێژووی ئارامیەکان لە کوردستان

بووبێ، ئەوەی (طبری) و (إبن الاثیر) باسی لێوە دەکەن، گومانی ئەوە دەکرێ ئەو ئاخافتنەی ئەردەوانی پێنجەم بۆ ئەردەشێر؛ یەکەم جوێن بێ، یاخود بەکەمی تەماشاکردنی ئەردەشێر بێ! نکوڵی لەوە ناکرێ ئەوسا کورد، نە دەسەڵاتی سیاسی هەبووە، نە دەسەڵاتێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەبووە ، بەڵکو کورد زیاتر دەوارنشین و کۆچەر و ڕەوەند و شوانکارە بوونە، هەتا لە هەندێ شوێن کۆیلە بوونە[1]!!

ئەگەر ئەگەری بەڕەسمی کردنی زەردەشتیەت لە دەوڵەتدا و کۆکردنەوەی ئاوێستا بێ، ئەمەش لە ڕاژەی گومانەکەی ئەو کەسانە نییە، کە بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەردەشێر کورد بووبێ، ئەو "ئاوێستا"یەی ئەردەشێر لە "تەورات" و "ئینجیلەکانی" جولەکە و فەلەکان دەکات، هەروەها وەك چۆن قوستەنتین گۆڕانکاری بنەڕەتی لە " مەسیحیەت" کرد، ساسانیەکانیش گۆڕانێکی عەقیدەیان لە زەردەشتیەت کرد، بڕیاریان دا زەردەشتیەتی بتپەرستی، کە خەڵکی لادێ و چیا نشینەکان پەیڕەویان دەکرد لە خۆ بگرێ[2].هەروەها ئەو بەشەی (ئاوێستا) کە مژدە بە هاتنی محمد دەدا لابردرا. هەروەها لە ئاوێستادا باس لە ڕوخانی دەسەڵاتی ساسانی بەدەست موسڵمانان دەکات، کە ئەویش لابردراوە: "موڵکی ساسان لەناو دەچێت بەدەست هاوڕێکانی پێغەمبەری عەرەبی.."[3]لە ڕووی نەتەوایەتیشەوە، ئەو ئایەتانەی باس لە (میدیا) دەکەن دەستکاری کراون و ئایینەکە کراوەتە ئایینی فارس بەتایبەتی و (ئاری) بە

---

١- بڕوانە ڕەشاد میران: ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا.

٢- ڕەشاد میران: ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، ل٢٧.

٣- حسن محمود، ل٢٤.

گشتی[1]. هەر ئەو ئەگەرەش وای کردووە، کە کورد لە زۆر شوێن واز لە زەردەشتیەت بێنێ و باوەڕ بە مەزدەکیەت و مانیەت و مەسیحیەت بێنێ!

لە ساڵی (٢٢٦ز) هەتا ساڵی (٦٥١ز) ساسانیەکان (٢٥) پادشایان هەبووە[2]. با بزانین کام لەم پادشایانە کوردستانی داگیر نەکردووە و کوردی نەچەوساندۆتەوە؟!

خەسرۆ گۆران لە لاپەڕە (١٤٨)ی "کوردستان لە مێژوودا" دەنووسێ:

"مەلیك ئەردەشێری پاپکانی یەکەم ((ئەرتەخشەتر)) (٢٢٦-٢٤١)ی زایینی) خۆی بە میراتگری ئەخمینیەکان و ئاڵا هەڵگری شکۆی ڕەسەنی فارسان دادەنا. بەتایبەتی سەروەری و شانازییەکانی مەلیك دارپوش، هەروا داوای گەڕانەوەی سنوری دەوڵەتی ئەخمینی دەکرد. "هەر لەسەر ئەو بنەما نەتەوە پەرستییەدا، ئەردەشێر وڵاتی کوردانیشی بە بەشێك لە دەوڵەتی ئەخمینی دەزانی، لێرە هەتا کاك شوانیش ناچارە دان بەوە بنێ، کە ئەردەشێر کورد نەبووە و شەڕی کوردی کردووە: "ئەردەشێر توانی ئیمپراتۆریەتێکی گەورە دابمەزرێنێت، کە بە ئیمپراتۆریەتی ساسانی ناسرا و ناوی فارسی بەسەر هەموو شتێکی کۆندا بڕی.. و پەلاماری میدیا و هەمەدانی دا و گرتنی، دواتر هێرشی کردە سەر ئەتروپاتین و ئەرمینیا[3].

هەر لەدوای ساڵی (٢٢٦)ش مەلیك ئەردەشێر بەخۆی ڕێبەرایەتی لەشکرێکی گەورەی کرد و هەڵیکوتایە سەر کوردانی چیای (ماسیوس)

---

٤- حسن محمود، ل٢٤.

١- بڕوانە ل١٤٩-١٥٠ی مفید رائف: معالم تاریخ الدولة الساسانية.

٢- شوان عوسمان، ل١٣٤.

لەناو جەرگەی کوردستان دا.. هەروەها لەشکری ساسانی لەگەڵ -مادك-ی حوکمــداری کوردســتانی باشــوردا تــێکگیرا [1]، پــەلاماری هــەرێمی جەزیرەشــی دا و شــارەکانی (حــەڕان) و (نوســەیبین)ی کەوتــە دەســت [2]. شــاری موصــڵیش دوای بەرگریــەکی تونــد، ئینجــا کەوتــە دەســت ئەردەشێر [3]. بەحوکمی ئەوەی هەندێ بەشی کوردستان لە ژێر دەستی ڕۆمەکانەوە بوو، ئەو ناوچانەش گرنگیەکی ستراتیژیان هەبوو بۆ دەوڵەتی ساسانی، بۆیە هەر لەسەردەمی ئەردەشێری یەکەمدا، پاش ئەوەی ئەرمینیا بووە بەشێك لە دەوڵەتی ساسانی، لە دەسپێکی ساڵی (٢٣٧) فارسە ساسانیەکان هەڵیان کوتایە سەر کوردستان و میسۆپۆتامیا و چ سەنگەر و مەتەرێزی ڕۆمانی هەبوو لەناوچەکەدا، هەموویان ڕاماڵی و پاك کردەوە [4]، لەسەردەمی ئەردەشێری یەکەمدا دیاردەیەکی نوێ بەرپابوو ئەویش ڕاگواستنی کوردبوو لە وڵاتی خۆیان و نیشتەجێ کردنی فارس لە وڵاتەکەیاندا، هەرێمی فارس کەمترین ڕووبەری هەبوو لە حەوت هەرێمەکەی، کە ئیمپراتۆریەتی ساسانی لێ دروست ببوو، بەڵام لەسەردەمی ئەردەشێر و خەلیفەکانی توانیان هەرێمەکەیان فراوان بکەن و زۆر لە خاکی هەرێمی چیا (کوردستان) بەزۆر دابڕن و بیخەنە سەر هەرێمی فارس [5].

ئەمە هەڵوێستی "کوردی گەورەبووی دەواری کوردان" بوو لە هەمبەر

---

٣- خەسرۆ گۆران، ل١٤٩.

٤- محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان، ل٨٥.

١- شوان عوسمان، ل١٣٤.

٢- خەسرۆ گۆران،ل١٥٠.

٣- حسن محمود کریم، کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا،ل٤٩.

کورد؟! با بزانین هەڵوێستی پادشاکانی دوای خۆی هەڵوێستییان چی بووە؟!

شاپوری یەکەم (٢٤١ز-٢٧٢ز) کوڕی ئەردەشێری یەکەم بوو، لە ژێدەرەکان هاتووە، کە شاپور یەکێ لە پادشا هەرە بەناوبانگەکانی ساسانی بووە، لە بەرایی فەرمانڕەوایی ویدا (ئەرمەنیا) و شانشینی (الحضر) لە دژی ڕاپەڕیون، بەڵام هەردووکی دەمکوت کردوون[1].شاپوری یەکەمیش وەك باوکی، بەشەکانی کوردستانی بە بەشێك لە دەوڵەتەکەی خۆی دەزانی، بۆیە ئەویش هێرشی کردە هەردوو بەشی کوردستان، دوای دەسەڵات وەرگرتنی؛ یەکەم کاری ئەوە بوو هێرشی کردە سەر کوردە چیاییەکانی (ئاتروپاتین)، دواتریش پەلاماری کوردەکانی هەرێمی چیاکانیدا[2]. موحەمەد ئەمین زەکی دەنووسێ: هەرێمی جەزیرە لەدوای مردنی ئەردەشێر لە دەسەڵاتی ساسانی یاخی ببوون[3]. ڕێتێدەچێ ئەم هەڵگەڕانەوەی بێجگە لە ئەگەری تامەزرۆی کورد بۆ سەربەخۆیی، پاڵپشتێکی ڕۆمانیشی لە پشتەوە بوو بێت، چونکە هەرێمی جەزیرە لەزۆر کاتدا ئەگەر لە ژێر دەستی ڕۆمەکانیش نەبووبێ، دەسەڵاتی ڕۆمانی لە دەڤەرەکە نزیك بووە. هەروەها کوردەکانی ئەو هەرێمەش زۆربەی مەسیحی بوونە، باوەڕیان بە زەردەشتیە ساختەکەی ئەردەشێر نەبووە. هەرێمی جەزیرەش بۆ شاپوور پێگەیەکی عەسکەری گرنگ بووە بۆ هەڕەشەکردن لە دەسەڵاتی ڕۆمانی، بۆیە دوای هێرشکردنە سەر ئەرمینیا

---

١- مفيد رائف، معالم،ص٤١.

٢- شوان عوسمان،ل١٣٤.

٣- محەمەد ئەمین، ل٨٥-٨٦.

و ئەتروپاتین و الحضر وەك (طبری) و (إبن الاثیر) دەنووسن : شاپور هێرشی کردۆتە سەر شارەکانی (حەڕان) و (نوسەیبین) و (جەزیرە) لە پاش کوشتارێکی زۆر توانیویەتی ئەو دەڤەرەش بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، ئەو پشێوی و سەرگەردانی سیاسیەی دەسەڵاتی ڕۆمانی گرت بۆوە، بە بەرژەوەندی شاپور تەواو بوو. لە پاش تیرۆرکردنی گۆردیان (٢٣٨-٢٤٤) هەم شاپور پایتەختەکەی (تەیسەفۆن -مەدائین) لە هەرەس رزگاریان بوو، هەم ئەلتەرناتیڤی (گۆردیان) ئەمپراتۆرێکی لاوازی وەك (فیلیپ)ی عارەب بوو، فیلیپ دەستبەرداری (ئەرمینیا) و ئەو بەشەی کوردستانی ئەویٚ بوو بۆ شاپور، پاش ئەوەی بەسەر (ڤالیریانوس) ئەمپراتۆری ڕۆماش زاڵ بوو، ناوی لەخۆنا "شای ئێران و غەیرە ئێران"[1]!

لە سەردەمی شاپوری یەکەمدا لە بیابانی سووریادا عەرەبێك فەرمانڕەوایی شاری (تەدمری) دەکرد، ئەو پاشا عەرەبە ناوی "ئەذینە (ئەدناتوس)ی عەرەبی بوو، ئەم شێخە توانی عەرەبە دەشت نشینەکان کۆبکاتەوە و بەگژ ساسانیەکانیانەوە وەبنێ و سالی (٢٦٣) لەشکری ساسانی ببەزێنێ و تا سەر ڕوباری دیجلە لە (میزۆپۆتامیا) بکەوێتە دوایان و ڕاویان بنێ"[2].لەم شەڕەدا عەرەبەکان دەستکەوت و ئافرەتێکی زۆری شاپوریان بەدەست کەوت شاپور خۆیشی زۆر بە زەحمەت رزگاری بوو[3].

---

١- رائف،ص٤٢.

٢- بڕوانە خەسرۆ گۆران، ل١٥٣، رائف ص٤٣.

٣- رائف، ص٤٣.

لە پاش نەمانی شاپوری یەکەم لە ساڵی ٢٧٢ هەتا ٣١٠ دەوڵەتی ساسانی بە قۆناغێکی ترسناك لە مێژووی خۆیدا تێپەڕی، لەم ماوەیەدا حەوت پاشا بوونەتە پادشای دەوڵەتی ساسانی: هورمزدی یەکەم (٢٧٢-٢٧٣)، بەهرامی یەکەم (٢٧٣-٢٧٦)، بەهرامی دووەم (٢٧٦-٢٩٣)، بەهرامی سێیەم (٢٩٣-٢٩٣)، نێرسی (٢٩٣-٣٠٣)، هورمزدی دووەم (٣٠٣-٣١٠).

لە سەردەمی ئەو حەوت پاشایەش ململانێی ساسانی و ڕۆمانی هەر بەردەوام بووە، لەو ماوەیەدا هاوسەنگی هێز زیاتر بەلای ڕۆماکاندا بووە، بۆیە دەبینین پادشاکانی ساسانی ناچار بوونە دەستبەرداری هەندێ لە خاکی کورد بن بۆ ڕۆمانەکان، بەهرامی دووەم دەست بەرداری (ئەرمینیا) و (جەزیرە) بوو بۆ رۆم[١].

هەروەها شا نێرسی لە بەرامبەر سوپای رۆمانی دا ناچار بوو دەسهەڵگرێ لە پێنج ویلایەتی ساسانی لە کوردستان بۆ رۆمانەکان، ویلایەتەکانیش ئەمانە بوون: ئەرزان، موکس، زابدیك، ریهیم و کوردۆ (کاردۆیان کوردۆئین)[٢]. لە زەمەنی شاپوری دووەم دا (٣١٠-٣٧٩) (ململانێی ساسانی و ڕۆمانی) هەر لە سنوری تەسکی نەتەوەیی نەما، بەڵکو مۆرکێکی دینیشی وەرگرت، هەندێ ژێدەر ئاماژە بەوە دەکەن ، کە قوستەنتینی ئەمپراتۆری رۆمانی (٢٧٤-٢٣٧) لە کاتی راگەیاندنی ریێ و ڕەسمی میلانۆ لە ساڵی ٣١٣ بۆتە مەسیحی[٣]. هەندێکی تر دەڵێن ساڵی

---

١- شوان عوسمان، ل١٣٥-١٣٦.

٢- خەسرۆ گۆران، ل١٥٤.

٣- رانف،ص٤٧.

٣٢٧ پاش ئەوەی لەسەرەمەرگدا شەهادەتی بە مەسیحیەت هێنا و مرد[١].

لـە حـەفتا سـاڵی فـەرمانڕەوایی شـاپوری دووەمـدا، دەوڵـەتی ساسـانی ڕوبەڕوی چەندەها هێزی ناوەخۆ و دەرەوە بۆوە. سـەرەتا کەوتـە شـەڕی عەرەبـەکانی بـەحرێن، بـەحوکمی ئـەوەی عەرەبـەکان هـەم پاڵپـشتی ڕۆمانیەکانیان کرد بوو، هەم بە دەسەڵاتی ساسانی ڕازی نەبوون، شاپور ئـەو عەرەبانـەی دەکەوتنـە بەردەسـتی؛ شـانی هەڵدەکێـشان، بۆیـە بـە شاپوری (ذو الاکتاف) لەناو عەرەباندا ناسرا بوو[٢]. لە ساڵی ٣٥٠.. هەتا ٣٥٧ شەڕی هۆزی (هۆن)ی کرد، لەو هەموو شەڕانەش سەرکەوتوو بوو، بۆیـە لەهـەر شـەڕێکدا ڕۆمانـەکان داوای (ئەرمـەنیا) و (میتۆپۆتامیـا) و گەڕانەوەی پێنج ویلایەتەکەی دەکرد، کە (نێرسی) لە دەستی دابوو[٣].

لە بەرامبەر کوردیش زۆر توند بوو، هەر بۆ نموونە کەسێکی وەك "مار قـەرەداغ" کـە لـە دایـك و بـاوکێکی زەردەشـتی لـە دایـك ببـوو، خۆیـشی ماوەیـەك بانگەشـەی بـۆ "زەردەشـتیەت" دەکرد و ببـوە میری میرنـشینی (ئەدیاب) یاخود هەولێر[٤]. پاش بڵاوبونەوەی مەسیحیەت لە کوردستان، کەسێکی وەك قەرەداغی باوەڕی بە مەسیحیەت هێنا و مەسیحیەتی کردە دینی میرنشینی ئەدیاب، لە ئاکامدا شاپوری دووەم هێرشی کردە سەر هەولێر و میر قەرەداغی کوشت[٥]. لـە ساڵی ٣٦٠ پاش ئەوەی لـە شـەڕی هـۆزی (هـۆن) تـەواو ببـو، پـەلاماری قـەڵای سەرسـەخت و قـایمی ئامـەد

---

٤ - خەسرۆ گۆران،ل١٥٨.

١- رائف،ص٤٧.

٢- خەسرۆ گۆران،ل١٥٨

٣- کلثومە،ص٤٨

٤- سەرچاوەی پێشوو.

(دیاربەکر)ی بندەستی ڕۆمەکانی دا و داگیری کرد، لە پاشان توانی بازبدا (جەزیرە) لە دەڤەری (زایدیك) لە کوردستانی باکور و چەند شاری دیکەی داگیر کرد[1]، لەپاش ئەم شەڕە، چونکە دەوڵەتی ڕۆمانیش تووشی هەندێ پشێوی سیاسی ناوخۆیی ببو، ناچار لەگەڵ شاپور ڕێککەوتن، کە بۆ ماوەی سی ساڵ (سوڵح) یاخود ئاگر بەست لە نێوانیاندا هەبێت، بەپێی ئەم سوڵحە دەبوو ڕۆمانەکان دەستبەرداری قەڵای نوسەیبین بن، ئەرمینیا و میتۆپۆتامیان بەساسانیەکان بدەنەوە[2].

لە پاش مردنی شاپوری دووەم (٣٧٩) جارێکی تر دەوڵەتی ساسانی دوچاری حاڵەتی پاشا گەردانی سیاسی و حوکمڕانی بوو، لەو ماوەیەدا دە پاشای ساسانی لەساڵی (٣٧٩) هەتا (٥٤١) حوکمی دەوڵەتی ساسانیان کرد[3].

هەرچی دەسەڵاتی ڕۆمانیش بوو، ئەویش دوچاری پشێوی و لێکترازان هاتبوو، لە ساڵی (٣٩٥)دا، یەکێتی ئیمپراتۆریای ڕۆمانی لەبەر ترازا و بەشێوەیەکی یەکجاری و ڕەسمی بووە دوو دەوڵەت:

١-ئیمپراتۆریای ڕۆمیی ڕۆژئاوا، کە هۆنوریوس حوکمڕانی تێدا گرتە دەست.

٢-ئیمپراتۆریای ڕۆمیی ڕۆژ هەڵات (بێزەنتی)، کە (ئەرکا دیۆس) حوکمڕانی گرتە دەست[4].

ڕۆمانەکانی ڕۆژئاوا لەسەر ئایینی خۆیان مانەوە هەرچی بێزەنتییەکان

---

٥- خەسرۆ گۆران، ل١٥٩.

١- سەرچاوەی پێشوو.

٢- ڕائف، ص٤٧-٤٨

٣- خەسرۆ.ل١٦٢

بوون لەسەر ئایینی مەسیحی بوون، مەسیحیەتیش سنوری دەوڵەتی ساسانیشی گرتبۆوە. ئەمەش پەیوەست بوو بە رەوشی نا لەباری سیاسی ساسانیەکان، نەك لێبوردەیی وەك هەندێ وای بۆ دەچن.

هەر لەو قۆناغەدا پشێوی ئایینی بە تایبەتی (مەزدەکی –زەردەشتی)، زەردەشتی مەسیحی زۆربەی دەڤەرەکانی دەوڵەتی ساسانی گرتبۆوە، کۆمەڵکوژی مەزدەکییەکان، کە مەسیحیەکان پاڵپشتیان دەکردن، ئەو رایە رەتدەکاتەوە، کە لێبوردەیی ئایینی لە دەوڵەتی ساسانی و بێزەنتی هەبوو بێ. سەبارەت بە رەوشی سیاسی کوردیش، بەحوکمی ئەوەی دەڤەری جەزیرە هەر ماوەیەك لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەرێك دا بووە، هەردەم شەرگەی نێوان ئەو دوو هێزە بووە، هەر لەو رەوشە نالەبارەی هەردوو لاش، ساسانیەکان لە دوبارە داگیرکردنەوەی دەڤەری جەزیرە نەسڵەمینەوە. لەسەردەمی کیسرا نوشێروان (٥٤١-٥٧٩) جارێکی تر دەوڵەتی ساسانی هەیبەتی خۆی پەیدا کردەوە، هەر چەندە لەسەردەمی ئەودا چەندەها ئارێشەی ناوخۆیی و دەرەکی لە ئارادا بوون، بەڵام نوشێروان توانی بەسەر زۆربەیان زاڵ بێ، لە رووی دینییەوە دربێکی کوشندەی لە مەزدەکیەکان دا، هەروەها توانی تورکەکان و عەرەبەکان تەمبێ بکات و هەرچی شەری بەردەوامی لەگەڵ بێزەنتییەکان بوو، بێزەنتیەکان ناچار بوون هەر لە سوڵح و ئاگر بەس دابن لەگەڵ نوشێروان دا. نوشێروانیش وەك پادشاکانی دی ساسانی، هەڵوێستی نەگۆری لە بەرامبەر کوردەکان هەبوو، هەرچی کوردەکانی ئەقلیم جیبال بوو، زۆربەی هەرە زۆری لەسەر دینی دەوڵەت بوون و ناچاریش بوون، کە ببنە سەربازی سوپای ساسانی، هەرچی شارەکانی دەڤەری جەزیرە بوو

چارەنووسیان پەیوەست بوو بە ڕەوشی سەربازی شەڕی ساسانی و ڕۆمانی. لەساڵی (٥٤٠ز) هێرشی کردە سەر جەزیرە و توانی شاری (الرها) (ئۆرفە) و (مەنبەج) و (دارا) بگرێت، دواتریش شاری (نوسەیبین)ی گرت[1].

لەپاش نەمانی نوشێروان (٥٧٩ز) سەردەمی شۆڕشی ناوخۆیی تەواوی دەوڵەتی ساسانی گرتەوە، هەتا فتوحاتی ئیسلامی (٦٣٧ز) شەش کەسی دی بوونە پادشای دەوڵەت، دوا پاشاش، کە ڕووبەڕووی سوپای ئیسلام بۆوە، یەزدگردی سێیەم (٦٣٢-٦٥١)بوو.

لەم کورتە پانۆرامایەدا، چ لەسەردەمی بەر لە زایین، چ لەسەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمانیدا، کە زیاتر لە چوار سەد ساڵی خایاند، کورد لە هەمووگەلێکی دی زیاتر باجی ئەو شەڕانەیدا، چونکە وڵاتەکەی بەتایبەتی دەڤەری جەزیرە، هەر گاڵ شەرگە و پێگەی ململانێی عەسکەری و دینی و قەومی هەردوو دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمانی بووە.

کاک شوان لەزۆرترین شوێن لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بەو شەڕانە کردووە، بەڵام لە کۆتایی باسەکەیدا تەواو داکۆکی لە دەسەڵاتی داگیرکەری ساسانی و ڕۆمانی دەکات: "نابینین حاڵەتێکی وا ڕوویدابێ سەبارەت بە بەخشین یا لەجیاتی دانی شارێکی فارسی ، یا بیزەنتی، بۆیە هیچ کام لەم دوو لایەنە شارە کوردیەکانیان بە وڵات و شاری خۆیان دانەناوە، بۆیە ئەم حاڵەتە لە مێژوودا بەزەقی دیارە[2]" .

ئەگەر هەر یەك لەم دوو دەوڵەتە دەڤەری کوردانی بەبەشێك لە

---

١- شوان عوسمان، ل١٣٧.

٢- شوان عوسمان، ل١٤٠.

دەسەڵاتی خۆی دانەنابێ، دەبوو ئەم هەموو شەڕەیان لە پێناو چی کردبێ؟! ئایا پادشاکانی ساسانی چەندان جار خەڵکی کوردییان لە دەڤەرە رەسەنەکانیان ڕانەگوازتوە بۆ دەڤەری تر، فارسیان لەجێ نیشتەجێ نەکردووە؟ ئەرێ بوونی ئەو هەموو زۆم و هۆبەی کورد لە ئەقلیمی فارس لە ئەنجامی چی بووە؟

کورد بە خۆهێشتنی خۆیان زێدی خۆیان بەجێ هێشتووە و لەناو فارسان ژیاون؟! ئەرێ ئەقلیمی فارس بەر لە دەسەڵاتی ساسانیەکان ئەقلیمێکی بچوك نەبوو، ساسانیەکان بەهۆی دابڕینی خاکی کوردان لە ئەقلیمی جیبال وا فراوان و گەورەیان نەکرد؟! ئەرێ (مانی) و (مەزدەکی) و (زەردەشتی) و (مەسیحی)، کورد لە هەردوو دەوڵەتدا دەیانتوانی عیبادەتی خۆیان بکەن؟!

کاك شوان و زۆرانی وەك ئەو دەیانەوێ مێژووی کورد بشێوێنن و واپیشان بدەن، کە بەر لە ئیسلام کورد لە دەوڵەتی ساسانی، خاوەنی پلە و پایەی خۆی بووە، هەروەها کورد زۆربەی هەرە زۆری زەردەشتی بوونە، بەڵام لە راستیدا رەوشی ئایینی و سیاسی کورد بەر لە ئیسلام هیچ بوونێکی سەربەخۆیی نەبووە، بەڵکو کورد وەك میللەتێکی نەتەوە و دین داگیر کرا، پاشکۆیەك بووە لەو دوو دەسەڵاتەدا، بەڕای من هەر ئەو ڕاستیە بووە، کە کورد لە (عەرەب)یش ئاسانتر موسڵمان بووە، عەرەب و فارس و ڕۆمانی، کە شەڕی ئیسلامیان دەکرد دەیانزانی ئیسلام هەڕەشە لە دەسەڵاتی ناشەرعی و دینە شێواوەکانیان دەکات، بەڵام دەبێ کورد لەبەر چ شەڕی ئیسلامی کردبێ؟! کورد بەر لە ئیسلام بەچەند سەدەیەك دین و نەتەوە و زمانی، نەك هەر داگیر کرابوو، بەڵکو خەریك بوو

ناسنامەی خۆیشی لە بوتقەی ساسانیەت لە دەستبدا، لەو پێودانگەوە دەتوانین بەڕاشکاوی بڵێین: کورد وەك نەتەوە و خاوەن دینی سەربەخۆ، هەرگیز شەڕی ئیسلامی نەکردووە، ئەگەر بوونی چەند ئاغا و دەرەبەگێك لە سوپای ساسانی و ڕۆمانی بکرێتە پاسا و بۆ بەشداری کورد لە شەڕی ئیسلامدا هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، چونکە ئەوانە بە قەولی ئەمڕۆ "جاشی ساسانی" یاخود "جاشی ڕۆمانی" بوونە!! بۆیە پاش شکانی بەرایی دەوڵەتی ساسانی، کوردەکان بە خۆ هێشتی خۆیان ئیسلامیان پەسەند کردووە.

# بابەتی چوارەم

## "ڕزگارکردن" و "داگیرکردنی" کوردستان لە هەردوو کتێبی: "کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا" و "کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد"

مامۆستا حەسەن محمود نوسەری کتێبی "کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا" لەسەرەباسێکی بەناوی "کوردستان و ئاینی ئیسلام کتێبێکی هەڵبەستراو" دا، ئامانجی سەرەکی خۆی لەمەڕ نوسینی کتێبەکەی خۆی "کوردستان لەبەردەم.." دەخاتە ڕوو. لە باسەکەیدا پاش توێژینەوە و بەدوا داگەڕان، گەیشتۆتە ئەو ڕاستیەی کە "مەلا ڕەئوف سەلیم حەوێزی" نوسەری حەقیقی کتێبی "کوردستان و ئاینی ئیسلام" نیە و ئەو کتێبە هەر کتێبی "فتوح سواد العراق"ە لەگەڵ هەندێ گۆڕانی کەمدا، کە (واقیدی) نوسیویەتی و (واعیظی) لە عەرەبییەوە بۆ فارسی وەریگێڕاوە و مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانیش کردویەتی بە کوردی[1]. لە نەزەری واقیدی و مەلا ڕەئوف و مەلا واعیظی و مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، کوردستان بەزەبری شمشێر داگیر کراوە و کوردێکی زۆر کوژراوە، هەروەها کورد ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردە و هاوەڵەکانی پێغەمبەریان کوشتووە، مامۆستا حەسەن لە کتێبەکەی خۆیدا دوپاتدەکاتەوە، کە ئەو زانیاریانەی لەو کتێبانەدا هەن، هیچ ژێدەرێکی مێژوویی پاڵپشتیان ناکات و ڕای بێ بنەمان. هەروەها "ڕێبێتێدەچێ"، کە سیاسەت و

---

١- حەسەن محمود، کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا، ل٣٢٣-٣٣٩.

مەزهەبکاری لە پاڵ بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە کتێبانە بن[١]!

جـا مامۆسـتا حەسـەن بـۆ ئـەوەی لـە بـنج و بنـەوانی مەسـەلەکە بگات،زۆربـەی ئـەو کتێبانـەی بـاس لـە "فتوحـاتی ئیـسلامی" دەکـەن دەخوێنێتەوە و لەسەر بنەمایەکی مێژوویی بۆ چوونەکانی واقیدی و مەلا رەئـوف و مـەلا واعیظـی و مـەلا جـەمیل هەڵدەوەشـێنێتەوە و دەنوسـێ: ئیسلام شەڕی کوردی نەکردووە، لە ئاکامیش هەموو شارە کوردیـەکان بـە ئاشتی لە دەست ساسانی و رۆمانییەکان رزگاریان بووە، بوونەتـە بەشـێك لە ئوممەتی ئیسلامی. ئەمە و بەرگی کتێبەکەی مامۆستا -حەسـەن-یش دەلالـەتی ئـەوە دەدات کـە، کـورد پێشوازیان لـە سـوپای ئیـسلام کـردووە، نەك بەرەنگاریان کردبێ.

ئـەم کتێبـەی مامۆسـتا حەسـەن لـە مـاوەی چـوار سـاڵدا سـێ جـار چاپکراوەتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە خوێنەران و ڕۆشنبیرانی کورد پەرۆشی ئەم جۆرە بابەتانەن لە بارەی بەشێك لـە مێژووی ون و شـاراوە و شێواوی باوك و باپیرانی خۆیان! بەڵام بێگومان ئەو حاڵەتە بەدڵی هەندێ لە ڕەوتی عەلمانی کورد نیە و، دەبێ رەدی کتێبەکەی مامۆستا حەسەن بدرێتـەوە، هـەموو ڕەتدانەوەیـەکیش کاریگـەر نیـە. خـۆ مـەلا جـەمیل رۆژبـەیانی لـە سـاڵی ١٩٩٧ کتێبـی وڵاتگـیری رەشـەخاکی عێراقـی بڵاوکردەوە، بەڵام سەدایەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام ئەگەر وەڵامی مامۆستا حەسەن لە "حەرەمی زانکۆ" بدرێتەوە چەند دکتۆرێك "ئۆباڵ لـە مل" بۆ قوتابییەکی خوێندنی باڵا بکەن، حەتمەن وەڵامەکە بەهێز تر دەبێ. هەر لەو پێودانگەوە بەناوی ئـەوەی لـە بـارەی فتوحـات نوسـراوە بەشێوەیەکی

---

١- سەلام، ئایا ڕاستە ئیسلام کوردستانی داگیر کردوە؟ ئاڵای ئیسلام ژمارە (٢-٣).

لایەنگرانە و نازانستی و نا ئەکادیمی نووسراوە و، دوورە لە میتۆدی توێژینەوەی مێژوویی[١]. د.نەبەزی ڕاگری پێشووی کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، بەبەردەوامی هانی دکتۆر (شوان عوسمان) دەدات "ماستەرنامەی" لەسەر "فتوحات" بنووسێ[٢]!! لە ناوەڕۆك دا ئەوەی مامۆستا (شوان) نووسیویەتی هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ کتێبی وڵاتگیری (ڕەشەخاکی عێراق) و (کوردستان و ئاینی ئیسلام) نییە. ئەوەندە نەبێ ئەم دوو کتێبە بەشێوازی گێڕانەوەی کۆن نوسراون، ئەوەی دکتۆر شوان پەیڕەوی "میتۆدی توێژینەوەی مێژوویی" کردووە!!

هەروەها هەر بۆ ئەوەی ڕەدی مامۆستا حەسەن لە "بەرگەوە"ش بداتەوە، بەرگێکی ڕەشی بۆ کتێبەکەی کردووە و نووسینەکانیشی بەرەنگی سۆر نەخشاندوە!

لەم کورتە لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدەدەین بەراوردێك لە نێوان هەردوو کتێب بکەین، بۆ ئەوەی بزانین ئاخۆ شارەکانی کورد رزگار بوونە لە دەست دەسەڵاتی ساسانی و ڕۆمانی، یاخود ئەو شارانە بەدەست سوپای ئیسلام داگیر کراون؟!

خەلیفەی ئیسلام عومەری کوڕی خەتاب پێش شەڕی قادسیە, شاندێکی دوازدە کەسی ڕەوانەی لای (یەزدگرد)ی دوا پاشای ساسانیەکان کرد و داوای لێکرد، کە موسلمان بێ، یاخود سەرانە بدات.

---

١- شوان عوسمان، کوردستان و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد، ل٤. ئەو ڕایەی کاك شوان ئەوە دەگەیەنێ کە کتێبەکەی کاك حەسەن زانستی و ئەکادیمی نیە، بەڵام ئەوەی خۆی ئەکادیمی و زانستی و بێ لایەنانە نوسراوە؟!

٢- شوان عوسمان، ل٤.

یەزگورد نەك هەر ڕازی نەبوو، بەڵکو گاڵتەشی بە شاندەکە کرد[١]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە دەوڵەتی ئیسلام هەتا ڕێگەی چارەسەری سوڵح و ئاشتی هەبووبێ و ناچار نەبووبێ، پەنای نەبردۆتە بەر چەك. ئەوەی لێرە گرنگە ئاماژەی پێ بکرێ ئەوەیە، کە شەڕی ئیسلام لەگەڵ دەسەڵات بووە، نەك لەگەڵ خەڵکی بێ تاوان و بێ چەك و کۆیلە و ژێر دەستە.

لەبەشی "ڕەوشی ئاینی و سیاسی کورد" ئەوە ڕوون کراوەتەوە، کە کورد پێش هاتنی ئیسلام بۆ دەڤەرەکە ولاتەکەی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمانی دابەشکراوە. هەروەها کورد خاوەنی دینێکی یەککگرتوو نەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا بابزانین گیرانی شارە کوردیەکان چۆن بووە.

یەکەم ڕووبەڕووبونەوە لە نێوان سوپای ئیسلام و سوپای ساسانی لە (١٣)ك/(٦٣٧ز)[٢] بووە، ئەو شەڕە لە مێژوودا ناسراوە بەشەڕی قادسیە[٣]. ئەو شەڕە دەروازەی دەوڵەتی ساسانی لەبەردەم سوپای ئیسلامی دا کردەوە، ئەو شەڕە شەڕێکی قەومی نەبووە وەك هەندێ "قەومی" لە "عەرەب" و "فارس" و "کورد"، کە هەریەکێ بەنیازێك بانگەشەی بۆ دەکات! عەرەب پێشتر شەڕی دەوڵەتی ساسانی‌یان کردووە،

---

١- مفید رائف العابد، معالم تاریخ الدوله الساسانیه، ص٧٧.

٢- عەرەب و ساسانیەکان زۆر پێش ئەم مێژووە ڕووبەڕووی یەکتر بوونەتەوە، لە زۆربەی جارەکانیش، عەرەبەکان لەشەڕدا دۆڕاندویانە بەواتای هەتا عەرەب لە ژێر ئاڵای "عەرەبایەتی" شەڕی ساسانی یاخود ڕۆمانی کردووە، لەشەڕدا هەر دۆڕاو بوونە.

٣- لە پێش شەڕی قادسیەدا، لە ساڵی (١٣)ی کۆچی شەڕی (النمارق) و (السقاطیة) و (باقسیاثا) و (پرد) لە نێوان لەشکری ئیسلام و لەشکری ساسانی ڕووی داوە، أحمد عادل، الطریق إلى المدائن، ص١٠٦-١١٠.

بەڵام شکستیان هێناوە، ئەمە و لە هەندێ ژێدەردا هاتووە بێجگە لە فارس و کورد، ئەرمەنیش لە سوپای ساسانی دا بوونە، بەجۆرێك ئەسقوف سیبیوس لە (مێژووی هەرقڵ) دەنووسێ:

دوو کەتیبەی ئەرمەنی یەکێ سێ هەزار و ئەویدی هەزار کەس بوونە، پاڵپشتی سوپای ساسانیان کردووە[١]. هەروەها هەندێ عەرەبیش پاڵپشتی ساسانییەکانیان کردووە، ئەمەو لە (امجاد الاکراد)یش دا هاتووە، کە سوپایەکی پێنج هەزار کەسی لە کوردان، کە بەشێکی سەرەکی سوپای تایبەتی کیسرا بوونە، پێشتر بە نهێنی موسڵمان بوونە و پاڵپشتی سوپای ئیسلامیان کردووە[٢]، کەوابێ ئەو کوردانەی لە سوپای ساسانی دابوونە، دەبێ "جاشی ساسانی" بووبن، چونکە بەرگریان لە دەوڵەتی ساسانی کردووە، لە نەزەری مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، ئەو کوردانەی هاوکاری سوپای ئیسلامیان کردووە، "جاشی ئیسلامی" بوونە!! بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کوردانەی بەرگریان لە ئیسلام کردووە "پێشمەرگە" بوونە، چونکە باوەڕیان بەسەربەخۆیی کورد و کوردستان هەبووە، نەك کۆیلە و بێ دەسەڵات و بێ دین بن و، لە ژێر ئاڵای دەوڵەتی ساسانی داگیرکەر بن!!

لە پاش قادسیە، سوپای ئیسلام توانی "مەدائینی" پایتەختی دەوڵەتی ساسانی بگرێت، ئەم گرتنە تەواوی لەشکری ساسانی خستە ترسەوە، بۆیە سوپایەکی گەورەیان کۆکردەوە بۆ بەرگریکردن لە

---

١- فرست مرعي اسماعيل: الكرد مصادر و معالم تاريخهم في صدر الاسلام (مرحلة الفتوحات) ص١٠٨.

٢- د. عبدالله مصطفى: امجاد الاكراد، ص٣٤.

دەوڵەتەکەیان. کاك شوان لە لاپەڕە (١٤٩) هەتا (١٥٣) باسی گیرانی جەلەولا دەکات، بەڵام پێمان ناڵێ ئەو شەڕە کەنگی بووە؟! دەبوو کاك (شوان) گرنگییەکی زۆری بەشەڕی جەلەولا بدابایە، چونکە ئەو شەڕە دەروازەیەك بوو بۆ گرتنی ناوچە کوردییەکان لە ئەقلیمی جیبال دا. سەبارەت بە مێژووی گرتنی ئەو شارە، مێژوونوسە موسڵمانەکان کۆك نین، (طبري) و (ابن الکثیر) و (بلاذري) و (ابن خلدون) باوەڕیان وایە لە ساڵی شازدەی کۆچی بووە،هەرچی (خلیفە بن خیاط) بووە دەڵێ: ساڵی حەڤدە بوو، یەعقوبیش دەڵێ: ساڵی نۆزدە بووە[1].

وەك دیارە ڕای زۆربە لەسەر ساڵی شازدەی کۆچییە[2]، شەڕی جەلەولا لە هەرێمی کوردان بووە، بۆیە شتێکی سروشتییە، کە کورد ناچار بکرێن وەك چەپەر بەکار بهێنرێن, نەك وەك کاك شوان دەنووسێ، هەڵبەتە ئەو لەشکرە (لەشکری ساسانی) زۆربەی کورد بوون[3]. کاك شوان لێرەدا دەیەوێ بڵێ: کورد بەخۆهێشتی خۆیان، وەك بڵێی سوپای ساسانی سوپای کوردان بووە، بەرگریان لێکردووە. کاك شوان لە لاپەڕە (١٥٢) دان بەوە دەنێ، کە شاری (مەندەلی) بە سوڵح گیراوە، بەڵام کە دێتە سەر شاری خانەقین دەقێکی (بەلازری) دەگۆڕێ "اعاجم" بەکورد تەئویل دەکات، بەلازری لە لاپەڕە (٢٦٤)ی "فتوح البلدان" دەنوسێ: "واتی جریر بن عبدالله خانقین وبها بقیة من الاعاجم فقتلهم" کەچی کاك شوان لە لاپەڕە (١٥٢-١٥٣) دەنووسێ:

---

١- الطبري: تاريخ الطبري ج٤/ص٢٤، ابن الاثير: الكامل في التاريخ ج٢/ص٣٤، إبن كثير: البداية و النهاية، ٧-٨، ص٧٢-٧٣، بلاذري: فتوح البلدان، ص٢٦٤،خليفة بن خياط: تاريخ خليفة بن خياط،ص١٢٦-١٢٧، اليعقوبي: تاريخ ج٢، ص١٥١.

٢- فرست مرعی،ص١٠٩

٣- شوان عوسمان، ل١٥٠.

هەروا (جەریر بن عبدالله البجلی) توانی پاشماوەی کوردەکان -عجم-ی کە لە خانەقینەوە مابوونەوە هەموویان بکوژێت.!! مامۆستا حەسەن لە بارەی شەڕی جەلەولا دەنووسێ: "سوپای ئیسلام لە مانگی سەفەری ساڵی (١٦)ی کۆچی بەرامبەر مانگی مارسی ساڵی ٦٣٧ زاینی بەرەو جەلەولا کەوتە ڕێ، لە ڕێگە لەگەڵ هەندێ خێڵ و عەشیرەتی ناوچەکە ڕێکەوتنیان مۆر کرد (ڕەنگە وەفد و نوێنەری کوردەکان، کە (ئەمین زەکی) باسی دەکات لەم کاتەدا بە موسڵمانەکان گەیشت بن و ڕێك کەوتبن!.[1]

هەڵگیرسانی شەڕی "جەلەولا" هەر بۆ زیاتر بە شەڕگە کردنی کوردستان بوو، تا کورد باجی شەڕەکە بدەن. یەزگوردی پاشای ساسانی خۆی لە حەلوان بوو، ئەگەر نا, هەتا کاك (شوان)یش دان بەوە دەنێ کە خەلیفە عومەر لەگەڵ ئەوە دا نەبووە، کە سوپای ئیسلام بەرەو هەرێمی کوردی بچێت[2]، بەڵام ساسانییەکان سوپای ئیسلامیان ناچار کرد هەڕەشەی ساسانییەکان لەسەر خۆیان دوور بخەنەوە.

---

١- حەسەن محمود، ل٥٣، شەرەفخان و موحەمەد ئەمین زەکی، د.عبدالله موستەفا پاڵپشتی ئەم ڕایەی کاك حەسەن دەکەن.

٢- کاك شوان عوسمان تەئویلێکی سەیر بۆ ئەو هەڵوێستەی خەلیفەی ئیسلام دەکات، لە ئەزەری خەلیفە "گیانی مرۆڤی موسڵمان زۆر گرینگتر بووە لە دەستکەوتی شەڕ"، بۆیە هەر لەبەرایی ئەگەر یەزگورد موسڵمان بوایە، یاخود ئامادەبێ جزیە بدات هیچ شەڕێك بەرپا نەدەبوو. کەچی شوان دەڵێ: ئەمەش مانای بەجیهانبوونی پرۆسەی فەتح و گەیاندنی ئایینی ئیسلام ناگەیەنێ (شوان، ل١٥٠). شوان دەبێ وا بلێ چونکە ئەو لەسەری بووە خەلیفە وا پیشانبدات، کە شەڕ لە دیدی ئیسلامدا ئامانجی سەرەکیە، لەم بارەیەوەش چەند ئایەتێکی قورئان بەهەڵە راڤە دەکات، هەر بۆ ئەوەی بە ئەوەی نوێ بلێ ئیسلام دینێکی جیهانی نوێیە هی هەموو نەتەوەیەك نیە! ڕاگرتنی شەڕ لەلای خەلیفە دوو ئەگەری سەرەکی لە پشت بووە، وەك وتمان گیانی مرۆڤ لای خەلیفە بەبەهاتر بوو لە دەستکەوتی جەنگ، دوو: خەلیفە نەیدەویست لەشکری ئیسلام شەڕی خەلکی ڕەسەنی ناوچەکە بکات کە کورد بوون. کەچی یەزدگورد و (کاك شوان) وا دیارە پێیان خۆش بووە شەڕ لە کوردستان بێ!

**مامۆستا حەسەن لە بارەی خانەقینەوە دەنووسێ: قەعقاعی کوڕی عەمریش لەولاوە کەوتە دوای دوژمن, تا گەیشتە خانەقین، هەرچی هێزێکی پەرتەوازەی فارسی هەبوو لەو ناوەدا لە ناوی بردن و خانەقینی بە ئاشتی گرت[1]، ئەم رایەش دەقا و دەق لەگەڵ دەقەکەی (بەلازری) یەکدەگرێتەوە، لە پاش گرتنی خانەقین، یەزگورد حەلوانیشی بەجێ هێشت و بەرەو چیا و شارەکانی دی هەڵات[2]، هەر لە کتێبەکەیدا مامۆستا حەسەن دەنوسێ: شاری "حەلوان"یش، کە یەزگورد کردبوویە پایتەختی خۆی (هاشم) بەبێ شەڕ گرتی[3].**

**ئەو رایەی مامۆستا حەسەن هەر لە ژێدەرە مێژووییەکاندا سەرچاوەی گرتووە[4]. ئەمە و بە حوکمی ئەوەی کوردی جەلەولا و حەلوان پشتیوانی کوردیان کردووە، دەقەرەکە دراوە بە کوردە موسڵمانەکان، هەر لەو بارەیەوە لە کتێبەکانی (طبري) و (ابن الاثیر) دەردەکەوێ، کە سەعد کوردێکی (قوباد) ناوی کردۆتە سەرداری حەلوان لە جیاتی (قعقاع)[5]دا. ئەمین زەکی مێژوونووس دەنووسێ: "لە گرتنی حەلوان یەکەم پەیوەندی**

---

١- حەسەن محمود، ل٥٧.

٢ - محمد ئەمین زەکی، ل٩٠-٩١.

٣- حەسەن محمود، ل٥٧.

٤- بلاذري، ص١١١.

٥- ئەمەش بەڕای خەلیفە بووە، هەروەها ئەمەش دوپاتدەکاتەوە، کە کوردی جیبال رۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە پرۆسەی وڵاتگیری کوردستاندا. هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ لەشکری ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی گەلانی ژێر دەستە لە ژێر ستەمی داگیر کاران و زاڵمان رزگار بکات و خاکەکەیان پێ بداتەوە.

کورد و گەلی کورد لەگەڵ سوپای ئیسلامدا ڕویدا[1].

مامەڵەی سوپای ئیسلام دەگەڵ کورد، حاڵەتێکی زۆر نائاسایی لە نێو کورد دا دروست کردووە، بە جۆرێ زۆربەی مێژوونووسانی کورد ئاماژەیان بەوە داوە، کە ئیسلام کاریگەری زۆری لە کورد کردووە، ناچار نەك هەر موسڵمان بوونە، بەڵکو شەڕی دەسەڵاتی ساسانیشیان کردووە[2]. ئەمەش لەوانەیە دوو ئەگەری لە پشتەوە بووبێ:

یەکەم: خەلیفەی ئیسلام نەیویستووە سوپای ئیسلام شەڕی کورد بکات، وەك دەڵێ" :خۆزگە لە نێوانی ئێمە و چیادا شاخێك, یان شورەیەك لە ئاگر هەبوایە، نە ئەوان بیانتوانیایە بێنە سەر ئێمە، نە ئێمەش بچینە سەر ئەوان[3] بێگومان خەلیفە دەرکی بەوە کردووە، کە کورد شەڕکەرن، شیمانەی ئەوەش دەکرێ خەلیفە زانیبێ ڕاڤەی ئایەتی (١٦) سوڕەتی (الفتح) مەبەست کورد بێ، کە لە بەرامبەر ئیسلام، یان شەڕ دەکەن، یان موسڵمان دەبن، خەلیفە پێی باش بێ گەلێکی ئاوا بەبێ شەڕ موسڵمان بێ، هەروەها لە نەزەری خەلیفە گیانی مرۆڤێکی موسڵمان زۆر گرنگتر بووە لە دەسکەوتی ماددی.

دووەم: بەشێك لە کوردان پێشتر موسڵمان بوونە وەك د.عبدالله دەنووسێ، کە پێنج هەزار کورد لە سوپای ساسانی بەنهێنی موسڵمان بوونە[4] هەروەها زەردەشتی خوداپەرست (نەك ئاگر پەرست) باسی ئیسلامی کردووە، ئەمە و کورد خۆی لە دەوڵەتی ساسانی دا خاوەن هیچ

---

٦- موحەمەد ئەمین زەکی، ل٩٠-٩١، هەروەها بڕوانە أحمد عادل، سقوط المدائن، ص٨٣.

١- حەسەن محمود، ل٦٧.

٢- حەسەن محمود، ل٨١

٣- د.عبدالله مصطفى، ص٣٤.

نەبووە، جا لەسەر چ بنەمایەك بەرگری لەو دەسەڵاتە بكەن؟ هەروەها سەركردەكانی سوپای ئیسلام لە مەدائین و جەلەولا و حەلوان، سەركردەی عەرەبیان نەكردۆتە سەرداری ئەو شارانە.

بێگومان ئەو هەڵوێستەش كاریگەری خۆی هەبووە.

هەر چەندە كاك شوان بانگەشەی ئەوە دەكات، كە ئەو پەیڕەوی میتۆدی توێژینەوەی مێژوویی دەكات، كەچی باسی گیرانی (تكریت)، پێش گیرانی "حەلوان" دەخات. یەكێ ئاگای لەو بەشەی مێژوو نەبێ وا دەزانێ "تكریت" پێش "حەلوان" گیراوە، نازانێ كە "گرتنی حەلوان" وەرچەرخانێكی ستراتیژی بوو لە ڕەوتی ڕوداوەكان، بە بەرژەوەندی موسڵمانان، هەرچی "گرتنی تكریت" بوو، "گرتنی موسڵ و نەینەوا"ی لێ كەوتەوە.

لە بارەی گرتنی "تكریت"ەوە كاك شوان وا باس دەكات، وەك بڵێی ئەو شارە لە ژێر دەستی دەسەڵاتی كوردی بووە، ئیسلام هاتووە شەڕی كوردی كردووە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو شارە لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمانیدا بوو، سوپای ڕۆمانی بەیارمەتی عەرەبی (ئیاد و تغلب و نەمر) خەریكی خۆ ئامادەكردن بوون لە دژی سوپای ئیسلام، كەچی سەیركە كاك شوان لە پەراوێزی لاپەڕە (١٥٣) چۆن مێژوو چەواشە دەكات: "كوردە شەهارجەكان بریتی بوون لە كوردە مەسیحیەكانی هەرێمی جەزیرە، كە بەهاوكاری دانیشتوانی كوردی موسڵ هاتبوون بۆ یارمەتیدانی كوردەكانی تكریت.

كاك شوان لەڕێی خوا، ئەگەر ئەو كوردانە بۆ یارمەتی كوردەكانی تكریت هاتبوون، ئەدی عەرەبەكانی جەزیرە و ڕۆمانەكان بۆ چ هاتبوون؟!

بۆ ڕاستی ناڵێی، ئەو کورد و عەرەبانە گەلی ژێر دەستە و مەوالیی ڕۆمەکان بوون، بە زەبری هێز هێنرابوون بۆ تکریت بۆ ئەوەی بەرگری لە دەسەلاتی ڕۆمانی بکەن!

لە مەسەلەی گرتنی (حەلوان)یش، کاك شوان زۆر ئەملا و ئەولا دەکات هەر بۆ ئەوەی سەرە داوێکی بەدەست بکەوێ بەوەی، کە (حەلوان) بەشەڕ گیراوە، بەڵام هەر خۆی ناچار دەبێ لە بەرامبەر ڕای (طبری) و (ابن الاثیر) و (ابن خلدون) و (بلاذری) بەچۆ کرابێت و دان بەوە بنێ، کە دانیشتوانی حەلوان بەسوڵح لەگەڵ عەرەبە موسڵمانەکان ڕێککەوتون[1]. هەروەها هەر کاك شوان دان بەوە دەنێ، کە سەرداریی ئەو شارە دراوە بە کوردێك بەناوی (قوباد) [2]. بەڵام لێرەدا بەهەڵە دەچێ،کە دەنووسێ: "سورەکان — الحمرة- بریتی بوون لە جەنگاوەرە کوردەکانی نێو لەشکری ساسانی، کە بەدیل گیابوون، لە بەرامبەر ئازادکردنیان ببون بە موسڵمان و جەنگاوەر لەنێو لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان". ئەمە ڕایەکی زۆر ناماقوڵە، چۆن خەلیفە "دیل"ێك دەکاتە سەرداری شارێکی وەك حەلوان.

حەلوان دەکەوێتە نێوان (ڕەشە خاك) و هەرێمی چیا. واتە ئەوسا پێگەیەکی ستراتیژی گرنگی هەبووە، بەڵکو لە ڕاستیدا ئەو سورانە، ئەو کوردە جەنگاوەرانە بوونە، کە پێش هاتنی ئیسلام بۆ دەڤەرەکە لە ڕێگای جابان و مەیمون و دێلم موسڵمان بوونە، سەرکردە و فەرماندە بوونە لە سوپای ئیسلام دا، بۆیە خەلیفە کەسێکی وەك قوبادی کردۆتە سەرداری

---

١- شوان عوسمان، ل١٥٧.

٢- کاك شوان عوسمان ئەگەر خەڵکی حەلوان پشتگیری ساسانیەکانیان کردبێ، چۆن لەشکری ئیسلام کوردێکی دەکردە سەرداری ئەو شارە، ئایا ئەمە هەڵەتزی و ناکۆکی نیە، جەنابتی تێ کەوتووە؟!

شاری حەلوان.

سەبارەت بە گیرانی "ماسبذان" کاك شوان لە لاپەڕە (١٥٨-١٦٠) پێنج ڕا لەسەر گرتنی ماسبذان دەخاتە ڕوو: بە بۆچوونی بەلازری و خەلیفە بن خەیات و قودامە بن جعفر و ابن کثیر و الذهبي، شاری ماسبذان بەبێ شەڕ گیراوە، کەچی (طبری) باوەڕی وایە شەڕ لە نێوان سوپای ئیسلام و فارس قەوماوە.

کاك شوان ڕای بەلازری و خەلیفە و قودامە و ابن کثیر و الذهبي پەسەند ناکات، بەڵام ڕای طبري پەسەند دەکات، "طبریش" دەنوسێ شەڕ لە نێوان موسڵمان و فارس بووە نەك موسڵمان و کورد!

هەرچی مامۆستا حەسەنە لە لاپەڕە (٨٤-٨٥) باس لە جەنگی (ماسبذان) دەکات، ئەو جەنگە دوو سێ قۆناغی هەبووە، لە ئاکام سوپای ئیسلام بەسەر سوپای ساسانی سەرکەوتووە، لە پاش کوژرانی (هورمزان) سوپاکەی بە تەواوی شکاوە و پاشماوەکەی بەرەو چیا ڕایانکردوە، بەڵام ساسانییەکان، هەر هێرشیان بۆ دەڤەرەکە دەهێنایەوە. لە لاپەڕە (٨٥) مامۆستا حەسەن دەنووسێ:

جارێکی تریش فارسەکان بەرەو شارەزوور هاتنەوە بۆ سەرکوتکردنی ئەو کوردە ڕاپەڕیوانەی، کە دژی دام و دەزگای فارس جەنگا بوون و مەیلیان بۆ سوپای ئیسلام هەبوو.

ئەو هاوکاریەی کوردان دەگەڵ سوپای ئیسلام لەلای کاك شوان تەواو پێچەوانە بۆتەوە، ئەو دەنووسێ: کورد لە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە و لە

دەسەڵاتی ئیسلام راپەڕیون[١].

(طبري) و (إبن الاثیر) دەنووسن، کە لە پاش ئەوەی (ضراری کوڕی خەتاب) (ئەزینی کوڕی هورمزان) دەکوژێ، پاشماوەی سوپای فارس بەرەو چیاکانی نزیك هەڵدێن، لە پاشان (ضرار) داوا لە خەڵکی کوردی هەرێمەکە دەکات، کە بگەڕێنەوە بۆ شاری خۆیان (سیروان) و ببنە موسڵمان، خەڵکەکەش بەدەم بانگەوازەکەی (ضرار) دێن[٢].

لەشەڕی (نەهاوەند)دا، کە لە ساڵی (٢١)ی کۆچی ڕوویدا، تا ڕادەیەك شەڕێکی یەکلاکەرەوە بوو بۆ ئەو شەڕە, ژێدەرەکان باس لەوە دەکەن، کە یەزگورد (١٥٠) هەزار کەسی کۆکردبۆوە، ماموستا حەسەن لە لاپەڕە (١٥٨) دەنووسێ، کە لە نامەی یەزگورد و سەرکردە فارسەکان داوا لە خەڵکی شارەزوور و هەرێمی چیا (کوردستان) و هەرێمی جزیرە نەکراوە. بە مەرجێ کوردستان ئەو کاتە ئەو سێ هەرێمە بوە.. هەر ماموستا حەسەن ئەگەری بەشداری نەکردنی کورد لە شەڕی نەهاوەند، یاخود داوا نەکردنی کورد لەلای یەزگوردەوە, دەگەڕێتەوە بۆ دوو ئەگەری سەرەکی:

یەکەم: وادیارە راپەڕینەکەی شارەزوور کاری خۆی کردووە و مەجالی نەهێشتۆتەوە بۆ یەزگورد و سەرکردەکانی، کە بەشوێنیاندا بنێرێ و زۆریان لێ بکات..

دووەم: دەکرێ یەزگورد ناردویەتی بەشوێن کوردەکان، ئەوانیش بەدەمیەوە نەهاتوون، هەر بۆیە لەلیستەکانی سەرەوەدا ناویان

---

١- کاك شوان لە لاپەڕە (٢٣٦) هەتا (٢٥٤) باس لە هەڵگەڕانەوەی شار و هەرێمە کوردیەکان دەکات، لە دوا بەشی ئەم نووسینە دا وەڵامی دەدەینەوە.

١- فرست مرعی، ص١٢١.

نەهاتووە[١].

سەبارەت بەرەوشی سیاسی سوپای ئیسلامیش، خەلیفە عومەر گەورە پیاوانی ئیسلامی کۆ کردەوە لە بارەی شەڕی نەهاوەندپرسی پێکردن، ئەو راپرسییە تەواوی چەمکی شوڕا دەگەیەنێ و تاکڕەوی ڕەتدەکاتەوە، لە ئاکامیش خەلیفە ڕاکەی (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب) پەسەند دەکات[٢].

با بزانین کاک شوان چۆن مەسەلەکان ئاوەژوو دەکاتەوە، جارێ با بزانین لە بارەی هەڵوێستی کورد لە هەمبەر سوپای ئیسلام لەدوای شەڕی نەهاوەند چ دەنووسێ: .. بەم شێوەیە پێگەیەکی سەرەکی و بەهێز بۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی ئیسلام دانرا، کورد بەر لە هەموو گەلانی تر ڕووبەڕووی ئەم هێزە بۆوە[٣].

ئەم ڕایە بێبنەمایەی کاک شوان لە هیچ ژێدەرێك ئاماژەی بۆ نەکراوە، مەگەر تەنها لە خەیاڵی کاک شوان خۆی نەبێ؟! ئەگەر نا هەر خۆی دەنووسێ: لە پاش شەڕی نەهاوەند لەشکری دەوڵەتی ساسانی کۆتایی پێهات، دەوڵەتی ساسانی هەر وەك نازناو مایەوە، ئەگینا لە سەر ئەرزی واقیعدا هیچ شتێکی نەما بوو، تەنانەت کیسرا ولایەتێك نەبوو بیگرێتە خۆی[٤]کاك شوان, کە دەوڵەتێکی تەمەن زیاتر لە چوار سەد ساڵ،خۆی لەبەر ئیسلام پێ نەگیرێ و بڕوخێ و کیسرا هیچ شوێنێ نەبێ خۆی تێدا بگرێتەوە، کوردی ژێر دەستەی ساسانی و ڕۆمانی، چۆن ڕوو بەڕووی ئیسلام بۆتەوە؟! ئەمە چ لۆژێکێکە؟!

---

٢- حەسەن محمود، ل١٥٨-١٥٩.

١- حەسەن محمود، ل١٦٣.

٢- شوان عوسمان، ل١٧٢.

٣- شوان عوسمان، ل١٧١.

ئەریٚ دەبێ "کورد" چ سوپا و دەوڵەتێکی هەبووبێ، تا بتوانێ ڕووبەڕووی سوپای ئیسلام ببێتەوە؟! سەبارەت بە شوڕاکەی خەلیفەی موسڵمانان لەگەڵ موسڵمانان، ئەوەی کاك شوان دەنووسێ، مەگەر تەنها خۆی باوەڕی پێ بێ، ڕازی بوونی خەلیفە بە ڕای ئیمام عەلی لەلای کاك شوان: "بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هێشتا لە نیمچە دورگەی عەرەبی ئاینی ئیسلام وەك عەقیدە لە نێو خەڵکەکەیدا جێگیر نەببوو، چونکە بۆچوونەکەی (علي بن ابي طالب) و جەخت کردنەوەی خەلیفەی موسڵمانان و، ڕازی بوونی موسڵمانان بە پێشنیارەکەی عەلی جەخت لەسەر ئەم ڕایە کرایەوە..[1]

هەر لە بارەی میتۆدی توێژینەوەی مێژوویی، پرسیارێ لە کاك شوان دەکەم؟

نەهاوەند لە ساڵی (٢١)ی کۆچی گیراوە، کەچی هەرێمی ئەهواز لە ساڵی (١٥-٢٠)ی کۆچی گیراوە، بەڵام نازانم کاك شوان بە چ پێوەرێك و لەسەر چ بنەمایەك لە لاپەڕە (١٦٣) باسی نەهاوەند دەکات، کەچی لە لاپەڕە (١٧٧) باسی گیرانی هەرێمی ئەهواز دەکات؟! ئەرێ هەر خۆیشت دان بەوە نانێی، کە شەڕی نەهاوەند شەڕێکی یەکلاکەرەوە بوو، لەشکری ساسانی کۆتایی پێهات؟ ئەرێ ئەگەر کۆتایی پێهاتبێ (کەواش بوو) چۆن لە پاشان شەڕی ئەهوازی پێ کراوە؟! ئەمەیە میتۆدی توێژینەوەی مێژوویی، ئەوەی ماموستا حەسەنیش، کە بەڕێك و پێکی لەسەر شێوازی گێڕانەوە و لەسەر دوان و شرۆڤەکردنی ڕووداوەکان نووسراوە، "نا زانستی" و "نا ئەکادیمی"یە؟!

لە ئەقلیمی فارس مێژوونووسان دەنووسن، کە چوار- پێنج ڕۆمی

١- شوان عوسمان، ل١٦٧-١٦٨.

کورد و چەند هۆبەیەك هەبوونە، لەو دەڤەرانە, هەر شەڕێکیش بووبێ (کە بووە) لەگەڵ کورد و دەسەڵاتی کورد نەبووە، چونکە ئەو دەڤەرانە نە کوردی بوونە، نە کوردیش دەسەڵاتی سیاسی سەربەخۆی خۆی هەبووە, تاکو ڕای خۆی هەبێ لەسەر شەڕ،یاخود ئاشتی!!

## گیرانی شارەکانی هەرێمی جزیرە:

دەڤەری جزیرە لە هەندێ ڕوو لەبەشی ئەقلیم جیبال جودا بوو، جزیرە لە مێژ بوو لە نێوان بەرداشی ململانێی ڕۆمی و ساسانی لەلایەك و زەردەشتی و گاوری و بتپەرستی لەلایەکی تر دابووە.

ڕۆژهەڵاتناسێکی وەك (برۆکلمان) لەبارەی ڕەوشی خەڵکی جزیرەوە – کە لە ئەصلدا کوردن– پێش ئیسلام ئاوا باس دەکات: ئەوسا خەڵکی ڕەسەنی دەڤەرەکە لە ژێر ستەمی کەنیسەی ئەرسۆدۆکسی دابوون[1]. ئەمە و سوپای ڕۆمی باجێکی زۆری بەسەر خەڵکدا سەپاند بوو، هەروەها لە پاش ئەوەی گاورێتی ببوە ئاینی ڕەسمی دەوڵەت، هەموو عیبادەتێکی دی یاساغ بوو[2]. هەندێ سەرچاوەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە خەڵکی جزیرە پێش ئەوەی سوپای ئیسلام بگاتە وێ، لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ موسڵمان ببون.

ئەو ئەگەرانە زۆر لە جێی خۆن، بۆ ئەوەی گیرانی شارەکانی دەڤەری جزیرە گران نەبێ.

ماموستا حەسەن لە لاپەڕە (١١٣) هەتا (١٣١) باسی "ڕزگارکردنی"

١- کارل بروکلمان: تاریخ الشعوب الاسلامیە، ص٩٧-٩٨.

٢- خەسرۆ گۆران: کوردستان لە مێژوودا، ل١٦٢.

شارەکانی دەڤەری جزیرە بە "ئاشتی" دەکات. لە ڕووی مێژووییەوە شاری (رقە) یەکەم شار دەبێ دەگیرێ.

ماموستا حەسەن دەنووسێ، کە شاری (رقە) لە ڕێگای سوڵحی نێوان بەتریقی رقە و (عەیازی کوڕی غەنەم) بە سوڵح و ئاشتی گیراوە، ئەو جۆرە سوڵحەی نێوان عەیاز و بەتریقی رقە، دەبێتە دەروازەیەك بۆ رزگارکردنی شارەکانی دی وەك ئورفە: (رەها) حەران، بەهار و شاری حەران نەك هەر بە سوڵح گیراوە، بەڵکو لە ڕێگای پاشای شارەکە، کە کورد بووە و زانای ناوچەکە، کە ناوی (یوقەننا) بووە، موسڵمان بوونە، لە پاشان سوپای ئیسلام ناوچەکە بەجێ دەهێڵێ، کاروباری بەڕێوەبردنی شارەکە دەداتە دەست خەڵکی شار خۆیان[1]. پاش ئەوەی شاری "راس العیون" لە سوپای عەرەبی و ڕۆمی رزگار دەکرێ، وەك (بلازری) و (إبن الكثير) دەنووسن، عومەیر دەڤەرەکە دەداتە دەست خەڵکی رەسەنی ناوچەکە (فدفعت الارض الى اهلها الاصليين)[2].

لە پاش گیرانی شاری "راس العیون" و موسڵمانبوونی (ئەرسالوس) حاکمی شار لەگەڵ پیاوانی ئایینی شارەکە و، شارەکانی دی وەك (دارا) و (بیرحا) و (باعما) و (سنجار) و (ئامێدی) و (میا فارقین) و (نوسەیبین) بەسوڵح و ئاشتی لەگەڵ سوپای ئیسلام ڕێککەوتون لە جزیرەی کوردان، ئەمە هەڵوێستی کورد بووە، کەچی عەرەبەکانی دەڤەرەکە و شام و هەندی پێیان کرابێ پاڵپشتی ڕۆمەکانیان کردووە، تا درەنگ موسڵمان نەبوونە، بەتایبەتی بەشێك لە عەرەبی هۆزی ئیاد، ئەمە و پێش گرتنی جزیرەش

---

١- حەسەن محمود، ل١١٩-١٢١.

٢- حەسەن محمود، ل١٢١.

عەرەبەکان لە گرتنی شاری هیت و تکریت و موسڵ پاڵپشتی سوپای ڕۆمییان کردووە[1].

ماموستا حەسەن،کە باس لە گرتنی شارەکانی جزیرە دەکات, هیچی لە خۆوە ناڵێ، بەڵکو پشت بە کتێبەکانی (بلاذری) و (إبن الاثیر) و (إبن اعثم) و (طبري) و (یەعقوبی)، هەتا واقیدیش لە هەندێ شوێن دەبەستێ. بلاذری دەنوسێ: "جزیرە ئاسانترین وڵات بوو, کە بە ئاشتی فەتح بووە..[2]" ابن الاثیر دەنووسێ: "هەرێمی جزیرە ئاسانترین وڵات بووە، کە بەئاشتی فەتح بووە..[3]"

(إبن اعثم) دەنووسێ: "بەمجۆرە موسڵمانەکان, ڕۆمە گاورەکانیان لە ڕەگ و ڕیشەی کوردستان دەرهێناوە[4]"، واقیدی دەنووسێ: "هەرێمی جزیرە بە ئاشتی گیرا".

طبریش دەنووسێ: "فکانت الجزیرة اسهل البلدان امرا، و ایسره فتحا"[5]

بێجگە لە ژێدەری ئیسلامی، ژێدەری تریش باس لەوە دەکەن، کە جزیرە بە ئاشتی گیراوە: الرهاوی المجهول: رضی کل من رأس العین و ماردین و امد[6]. ئیلینا برشینایا و إبن العبری ئاوا باسی گیرانی هەندێ لە شارانی جزیرە دەکەن:

---

١- سەرچاوەی پێشوو.

٢- بلاذری، ص٢٠٤.

٣- حەسەن محمود، ل١٣٠-١٣١.

٤- حەسەن محمود، ل١٣٠-١٣١.

٥- طبری، ج٤،ص٤٥٧

٦- فرست مرعی، ص١٣٤.

"وفيها دخل عياض بن غنم (سروج) و (الرها) صلحا. وفيها افتتح ايضا (الرقة) و(امد) و(نصيبين) و(طورعبدين) و(ماردين) صلحا."[(١)]

با بزانین گێرانی ئەو شارانەی جزیرە لە كتێبەكەی كاك شوان چۆن باسی لێوە كراوە: سەبارەت بە گرتنی شاری (رەقە) دوو سەربردە دەهێنێتەوە، بەڵام ئەویش هەر جەخت لەسەر ڕای (بەلازری) و (ابن الاثیر) دەكات، بەوەی ئەو شارە لە ڕێگای سوڵحی نێوان (عەیاز) و بەتریقی شارەكە ڕێككەوتون و بەبێ شەڕ گیراوە[(٢)].

كاك شوان لە چەواشە كردن، تەكنیكێكی ئاشكرا بەكار دێنێ، چونكە هەر خۆی لە لاپەڕە(٢١٦-٢١٧) باسی گرتنی شاری ئۆرفە -ڕەها- و حەران و (بەهار)، بەبێ بەرگری و شەڕ دەكات، لەم بارەیەوە ڕای (طبری) و (إبن الاثیر) و (بەلازری) و (قدامە بن جعفر) و (إبن خلدون) دێنێتەوە، بەڵام لە لاپەڕە (٢١٨) دەنوسێ: لەو هەموو بۆچوونانەی باسمان كرد بۆمان دەردەكەوێ، كە حەڕان دوای بەرگری و گەمارۆدان و ڕەوپێكردن ئینجا كەوتۆتە دەست لەشكری عەرەبە موسڵمانەكان؟!

بە واتای ژێدەرەكانی كاك شوان دەڵێین: (حەران) و (ڕەها) بەسوڵح و ئاشتی و دانی جزیە ڕزگار كراون، كەچی كاك شوان تەئویلی ئەو سوڵحانە بە "بەرگری!" و "گەمارۆدان!" و "ڕەوپێكردن!" دەكات!

كاك شوان لە لاپەڕە (٢١٧) دان بە زیرەكی (عەیازی كوڕی غەنەم) دەدانێ بەوەی، كە توانیویەتی "بەیەك ڕێككەوتن دوو شاری بكەوێتە دەست"..

١- فرست مرعی، ص١٣٤.

٢- شوان عوسمان، ل٢١٥-٢١٦.

عەیاز چووە شاری ئۆرفە و ئاشتی نامەی لەگەڵ دا بەستن[1]. هەر خۆی لە پەراوێزی (یەکی) لاپەڕە (٢٥٠) دەنووسێ: " لە کاتی پرۆسەی فتوحاتی عەرەبە موسڵمانەکان، زۆربەی شارەکانی جەزیرە لەسەر بنەماکانی ئاشتی نامەی شاری ئۆرفە -الرها- لەگەڵ عەرەبە موسڵمانەکان ڕێککەوتون.

کەچی کاک شوان لە لاپەڕە (٢١٨) دەنووسێ: "سەربازی ڕۆمە بیزەنتنیەکان نەك هەر (ئۆرفە)، بەڵکو هەموو جەزیرەیان چۆڵ کردبوو، بەرگریان تێدا نەکرد و خەڵکی شارەکەیان بۆ چارەنووسی نادیار جێهێشت، ئەوە بوو هەر خەڵکەکە شەڕی عەرەبە موسڵمانەکانیان کرد."

ماموستا شوان: لە کتێبەکانی (طبری) و (إبن الاثير) و (إبن الكثير) و (بەلازری) و (قدامە بن جعفر).. هتد. زانیاری ئەوها هەیە؟!

ئەگەر هەیە ئەدی چۆن وەڵامی لاپەڕە (٢١٧) و (٢٥٠) خۆت دەدایەوە کە ژێدەرەکان دەڵێن: خەڵکی ئۆرفە بەسوڵح لەگەڵ عەیاز ڕێککەوتن و ئەو ڕێککەوتنە بووە بنەمایەك بۆ گیرانی تەواوی جەزیرە؟!

کاك شوان لە لاپەڕە (٢١٨) دەنووسێ: ڕۆمەکان جەزیرەیان چۆڵکردبوو کەچی لە لاپەڕە (٢١٩) دەڵێ "ئینجا شەڕ و کوشتار لە نێوان هەردوو لا دەستی پێکرد"! لە باسی گرتنی شاری (شمیشات) ژێدەرەکان لە غەیری سوڵح و ئاشتی باسی هیچ جۆرە شەڕێك ناکەن، بەڵام کە موسڵمانەکان بەسەر زۆربەی قەڵا و دێهاتەکانی شمیشات زاڵ دەبن.. ئەو حاڵەتە وای لە کاك شوان کردووە هەڵوێستەکەی ئاوا شیکار بکات: "ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە خەڵکی شارەکە شەڕیان کردووە و بەرگریان لە شارەکەیان کردووە، بۆیە

---

١- شوان عوسمان ل٢١٥-٢١٦.

موسڵمانەکان قەڵا و دێهاتەکانیان گرتووە..[1].

لێرەدا گرنگە پرسیارێ بوروژێنین، دەبێ خەڵکی ئەو شارانە، کە زۆربەی هەرە زۆری کورد بوونە، لە پێناو چی شەڕیان کردبێ؟! دەبێ دەوڵەتی بێزەنتی تەعبیری لە ویستی کورد کردبێ؟! دەبێ عەرەبەکانی جەزیرە -کە زۆر دژی ئیسلام بوون- ئامۆزای کورد بوونە و کورد لە پێناو رۆم و عەرەب شەڕی ئیسلامی کردبێ؟!

سەبارەت بەگرتنی (ئامەد-دیاربەکر)، کاك شوان دوو ڕای جیاواز دەهێنێتەوە. بۆچوونێك ئەوەیە: کە شاری (ئامەد) لە سەر بنچینەی ئاشتی نامەی شاری (ئۆرفە) لەگەڵ لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان ڕێککەوتون[2]. ئەمەش لە کتێبە مێژووییەکانی (فتوح البلدان- ل١٨٠)/ (کتاب الفتوح (٣٣٩-٣٤٠) الخراج و الصناعة- ل٣٨٣)، هاتووە.. (عیاضا فتح امد بغیر قتال علی مثل صلح الرها..)، کاك شوان هەر لە لاپەڕە (٢٢٣) دا بۆچوونی دووەم دەنووسێ: عەرەبە موسڵمانەکان گەمارۆی ئامەدیان داوە و ئینجا شەڕ و کوشتار دروست بوو.. ئەم بۆچوونەی دووەم لە ڕاستی نزیکترە".. بەڵگەی کاك شوان بۆ ئەو ڕایە ئەمەیە, گەر تەماشای لاپەڕە (٢١-٢٢) کتێبەکەی خۆی بکەین، دەبینین لەو دوو لاپەڕەیەدا, نە ناوی (ئامەد) هاتووە، نەباسی شەڕیش کراوە!! ئائەمەیە ئەکادیمیەت!!

کاك شوان لە گرتنی شارەکاندا شێوازێکی چەواشەکەر بەکار دێنێ، بەڵام لە کارەکەیدا زیرەك نیە، چونکە ئەمە مێژووە و ژێدەری دەوێ. هەروەها عەقڵیەتێکی شرۆڤەکاری ساخلەمی دەوێ.. لە لاپەڕە (٢١٤)

---

١- شوان عوسمان، ل٢٢١.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٣.

دەنووسێ: "ژمارەی هێزی پشتگیری کورد بۆ ڕۆمەکان بە ٣٠ سی هەزار جەنگاوەر مەزەنــدە کــراوە"، یـەکێ لـەو ژێدەرانـەی کـاك شـوان ئـەو زانیاریيـەی لێ وەرگرتووە گوایە (تاريخ الرسل و الملوك)ی (طبری)یە ج٤ ل٢٣٢-٢٣٣ . لەئاکام تەماشای ئەو بەشەو لاپەڕانەم کرد، هیچ زانیاری ئەوهای هەر تێدا نیە، لە باسی (فتح الجزيرة) ج٣ ل٤٥٦-٤٥٩ طبری، باسی گرتنی جەزیرە دەکات، یەك ڕستەش لەو بارەیەوە نالێ!!

لـە زیهنـی کـاك شـوان هـەر شـارێك، ئەگـەر جارێـك لـە دژی دەسـەڵاتی خەلیفـە ڕاپـەڕی، ئـەوا بەڵگەیـە کـە جـاری یەکـەمیش بەشـەڕ و کوشـتار دەستی بەسەر داگیراوە، لەو بارەیەوە (مەلاتیە) بە نموونە دەهێنێتەوە[1] .

لە بارەی گیرانی شاری (میا فارقین) کاك شوان (لێکدانەوەیەکی سەیر دەکا، بەڵام نازانم بەچ پێوەرێکی توێژینەوەی مێژوویی!) دەنوسێ:

"عـەیاز لەشـکرێکی ٥٠٠ پێـنج سـەد سـوارەی نـاردە سـەر شـاری فـارقین، بەفەرماندەیی "چبە بن عـدی"، هـەتا ئێرە لـە لاپـەڕە (١٨٠) (فتوح البلدان) وەرگیراوە، بەڵام کاك شوان ئەو مەسەلەیە ئاوا لێکدەداتەوە: هەڵبەتـە شەڕ و پێکدادان هەبووە، چونکە لەشکری سوارەی ناردۆتە سەر، کە مەبەست لێـرە لـە ناکـاو و خێرایـە! هـەروەها لەمـەڕ گرتنـی شـاری نوسـەیبین، دەنووسێ: شەڕ و کوشتارێکی زۆر دروست بووە[2]

بەڵام کێ وەدەڵێ؟! خۆی لە ڕاستیدا شاری (نوسەیبین) وەك شاری (ئورفە) بەسـوڵح ڕزگـار کـراوە: وفـتح (عيـاض) نـصيبين.. وفـتح قـردی و

---

١- شوان عوسمان، ل٢٢٤.

٢- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

**بازیدی علی مثل صلح نصیبین[1].**

**هەروەها سەبارەت بە گرتنی شاری (ماردین) دەنووسێ: (١٧٦٦) کەس کوژراوە، ئەمە لە کتێبی (فتوح الشام)دا هاتووە، بەڵام گریمان ڕای (واقیدی) ڕاستە؟! بەڵام دەبێ ئەو (١٧٦٦)ە کێ بووبن؟ ڕۆمی داگیرکەر، عەرەبی جاشی ڕۆمی، یاخود کوردی دەست بەسەر؟! هەروەها لە لاپەڕە (٢٢٦) دەنوسێ: دوای ماوەیەك لە گەمارۆدان، کە هەڵبەتە شەڕ و کوشتار ڕوویداوە (کێ وا دەڵێ؟!) لە لایەن دانیشتوان و لەشکری عەرەبە موسڵمانەکانەوە ئاشتی نامەیەك بەسترا لەسەر هەمان مەرج و بنچینەکانی ئاشتی نامەی (ئورفە)، هەرچی شاری (سەرکانی-راس العین)، لە پاش کوژرانی شەهربازی پادشای ڕۆم، حاکمی شارەکە بەخۆی و ئەحبار و خەڵکێکی زۆری شارەوە موسڵمان بوون.. خەڵکی ئەم شارە بەپێچەوانەی ناوچەکانی تر بە ئاسانی ڕوویان لە ئیسلام کرد، کەچی لە نەزەری کاك شوان: "شاری سەرکانی لە هەموو شارەکانی تری جەزیرە زیاتر لە دژی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان[2] بەرگری کرد)**

**ئەم ڕایەی کاك شوان لە ژێدەرە کۆنەکانەوە نەهاتووە، بەڵکو لە (کارل بروکلمان) و (مسعود الخوند) وەرگیراوە؟!**

**پاش ئەم کورتە بەراوردییە، ئەوا تەواو ئاشکرا دەبێ، کە لەشکری ئیسلام هەردوو هەرێمی کوردستانی لەژێر دەستی ساسانی و ڕۆمی ڕزگار کردووە. زۆربەی هەرە زۆری شارە کوردیەکانیش بەرەنگاری لەشکری ئیسلامیان نەکردووە، هەر شەڕێکیش ڕووی دابێ لەگەڵ کورد**

---

١- بلاذری،ص١٨٠.

٢- شوان عوسمان، ل٢٢٧.

نەبووە، بەڵكو لەگەڵ دەسەڵاتی داگیركەری ساسانی و ڕۆمی و دەرەبەگ و ئاغای عەرەب و كورد بووە. ئەوانە وەك لە پێشوو ڕونمان كردەوە ئەو عەرەب و كوردانەی لە هەندێ جێ بە پاڵپشتی دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمی شەڕی لەشكری ئیسلامیان كردبێ لە پێناو كورد نەبووە، بەڵكو لە پێناو مانەوەی حاڵەتی داگیركردن بووە لە كوردستاندا!

# بابەتی پێنجەم

# چەمکی جزیە و ڕۆڵی جزیە لە ڕزگارکردنی کوردستان بە ئاشتی

نەیارانی ئیسلام زۆر ڕاڤە بۆ "جزیە" دەکەن و وا پیشان دەدەن، کە "جزیە" جۆرێك بێ لە ماف خواردن و سزا و لێکدانەوەی ئیسلام لەسەر بنەمایەکی ماددی. لە ڕاستیدا "جزیە" لە مێژووی فتوحاتی ئیسلامیدا ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە، سەرەتا شێوازێك بووە بۆ پێکەوە ژیان و لێبوردەیی ئایینی، لە پاشان قەبوڵکردنی یەکتر.

پێدڤیە تەواو لە چەمکی جزیە بکەین، ئینجا باس لە کاریگەری وی بکەین بەسەر ڕەوتی فتوحاتی ئیسلامی دا. ئەو عەقلیەتە مەدەنییەی ئیسلام لە بونیادی کۆمەڵگەدا فەراهەمی هێناوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لایەنە مەعریفیە ئازادیخوازی و مرۆڤایەتیەی خودی ئیسلام خۆی.

جزیە لە زماندا واتای سزا دەدات، لە کوردیدا پێی دەگوترێ "سەرانە" لە ئینگلیزیش" "poll tax".[1] لە ئەسڵدا ئەم جۆرە باجە لە پیاوانی خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان بەرامبەر بەسەربازی نەکردن لە لەشکری ئیسلامدا وەرگیراوە، هەروەها لە بەرامبەر ئەو باجەدا, دەوڵەتی ئیسلام دەبێ گیان و ماڵی ئەو کەسانە لە هەرەشەی ناوخۆ و دەرەوە بپارێزێ. هەر لەسەر ئەم بنەمایە هەندێ شەرعناس جزیە, یاخود سەرانە بە "باجی

1-Studies of Theology,p.150

بەرگری لێکردن یاخود داکۆکیکردن" دادەنێن[١]. هەر لە مێژووش چەندان جار ڕوویداوە، کە سوپای ئیسلام نەیتوانیبێ بەرگری لە "ئەهلی ذمة" بکات جزیەی لێ وەرنەگرتوون, بەڵکو بۆی گێڕاونەتەوە[٢].

ابو یوسف، کە لە سەدەی دووەمی کۆچی ژیاوە و کتێبێکی پڕ بەهای، لەسەر داوای خەلیفەی عەبباسی هارون الرشید (١٧٠-١٩٣ك/ ٧٨٩-٨٠٩ ز) داناوە[٣]، بڕی ئەو (جزیە)یەی دیاریکردووە بەم شێوەیە:

"دەوڵەمەندەکان (٤٨)درهەمیان دەدا، چینی ناوەڕاست (٢٤) درهەم، کرێکار و دەست ڕەنگینەکان (١٢) درهەمیان دەدا، ئەوسا هەر (٢٤) درهەم یەك دیناری عێراقی دەکرد" ئەهلی ذمة لەسەریان نەبوو, نە زەکات بدەن, نە "صدقە"ش بدەن، بەڵام لەسەر تاکی موسڵمانە، کە زەکات و صدقە بدات، زەکات لە ئیسلامدا زۆر گرنگە و پایەکە لە پایەکانی ئیسلام, هەر موسڵمانێ نەیدا و باوەڕی بەوە نەبێ، کە زەکات پایەکە و دەبێ بدرێ, ئەوا لە بازنەی ئیسلام دەردەچێ. کاتی خۆی لە پاش وەفاتی پێغەمبەرﷺ هەندێ هۆز، کە موسڵمانیش ببون، ئامادە نەبوون زەکات بە دەوڵەتی خەلافەت بدەن، بۆیە خەلیفەی ئیسلام ئەبوبەکری صدیق شەڕی ئەو هەڵگەڕاوانەیان کرد. لە ڕووی دراوییەوە، ئەوەی موسڵمانە لەسەریێتی بیدا, بەهیچ جۆرێ لەگەڵ سەرانە بەراورد ناکرێ، ئەوەی دوایی بە بەراورد بە زەکات و صدقە هیچ نیە.

---

١- هەمان سەرچاوە

٢- بنوارە: أبو یوسف، الخراج، ص٨١.

٣- الخراج،ص٦٩-٧١.

لەسەر ئەم بنەمایە، با زیاتر لە ماهیەتی سەرانە بکۆڵینەوە:

١-سەرانە بەهایەکی ماددی نیە بەرامبەر بەبێ باوەڕی، لە هەردوو ژێدەرە سەرەکیەکەی ئیسلام: قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ مەسەلە ڕۆحی و مەعنەویەکان زۆر لە بەها ماددیەکان گرینگتر هاتوون. بەواتای لە ڕوانگەی ئیسلام، ڕزگارکردنی مرۆڤ لە زوڵمی مرۆڤ بە پلەی یەك دێ. ئیسلام موسڵمانبوونی تاك و کۆمەڵگا بەگرینگتر دەزانێ لەو بڕە پارەیەی، کە ئەهلی ذمة بە "بيت المال"ی دەوڵەتی ئیسلامی دەدات. لە کاتی خەلیفە عومەری کوڕی عبدولعەزیز والییەکی موسڵمان لە نامەیەکدا بۆ خەلیفە، نارەحەتی خۆی دەردەبڕێ بەوەی، کە ئەهلی ذمة موسڵمان دەبن، ئەمەش کار لە رەوشی "بيت المال" دەکات. خەلیفە زۆر بە توڕەیی وەڵامی ئەو والییە دەداتەوە بەوەی، کە موسڵمانبونی ئەو کەسانە کاری ئیسلامە، نەك سەرانە وەرگرتن، لەو بارەیەش قەولێکی بەناوبانگ دەڵێ: پێغەمبەری ئێمە هاتووە بۆ رزگاری مرۆڤ و بانگەواز کردن بۆ ڕاستیی،نەك پارە کۆ بکاتەوە[1].

٢-سەرانە سزایەك نیە بەرامبەر بەباوەڕ نەبوون بە ئیسلام[2]، لە ئیسلامدا ئازادی دین و لێبووردەیی دینی شەنگستێکی گرنگی ئیسلامە.

"لا اكراه في الدين" [3]، ئیسلام کەس ناچار ناکات بەخورتی باوەڕ بە ئیسلام بێنێ، چونکە مرۆڤ سروشتی ئیسفەنجی هەیە، ئەگەر بەخورتی

---

1- Studies of Theology, p.153

٢- توماس أرنولد، الدعوه إلى الاسلام، ص٧٩.

٣- سورەتی البقره ئایەتی (٢١٦).

بێ هەر، كە ئەو گوشارە نەما، تاكەكە دەگەڕێتەوە بۆ باری خۆی. لە مێژووی ئیسلامدا بەدەگمەن شتێكی ئەوتۆ ڕوویداوە، لە نێو كورد دا، جولەكە و دیانە (مەسیحی)كان، كە پێشتر ئەهلی ذمة بوونە، پەیتا پەیتا موسڵمان بوونە. ئەوانە ئێستاش لەناو كورددا پێیان دەوترێ "بن جو" بۆ جولەكەكان، "بن دیان" بۆ مەسیحییەكان. ئەوە سەبارەت بەوانەی، كە موسڵمان بوونە، بەڵام بوونی ئەو هەموو مەسیحییە لە كوردستان بەڵگەیەكی دیكەیە لەسەر ناچارنەكردنی (ئەهلی ذمة) ئیسلام قەبوڵ بكات.

ئەمە و ئەگەر سەرانە سزا بوایە، دەبوو ئەو سزایە هەموو كەسێكی جولەكە و مەسیحی و زەردەشتی.. بگرێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی سەرانە سزا نیە، بۆیە لە ژن و منداڵ و هەژار و پیاوانی ئایینی و پەككەوتە و ئەو كەسانەی، كە پێشتر زەنگین بوونە، لە پاشان نەدار بوونە، وەرنەدەگیرا، بەڵكو تەنها لەو پیاوانە وەردەگیرا، كە توانای كاركردنیان هەبوو لەگەڵ كاركردنیان هەژارنین.

٣-سەرانە قەرز نەبوو بەسەر تاكەوە، ئەگەر مرۆڤێك بمردبوایە و سەرانەی نەدابایە، برا و كوڕەكانی، نەدەبوو لە بری ئەو پارەكە بدەن. هەروەها ئەو بڕە پارە لە ماڵ و منداڵ وەرنە دەگیرا، لەمە زیاتر ئەگەر زەمییەك نەدار و پەككەوتە بوایە، لە "بیت المال"ی دەوڵەتدا موچەی بۆ دەبڕایەوە[١].

٤-سەرانە لە جیاتی ڕاژەی عەسكەری بووە، سەربازی كردن بۆ

---

١- سەرچاوەی ژمارە (١) و ژمارە (٣).

دەوڵـەتی ئیـسلام،پایەکی گـرنگ بـووە بـۆ پاراسـتنی گیـان و مـاڵی موسڵمانان. هەروەها لـە هـەمان کاتدا چەند سوپای ئیسلام بەهێز بووە، (ئەهلی ذمة) زیاتر لـە تـەناهی دابوونـە، بۆیـە لەسـەر هـەموو موسڵمانێکی خـاوەن شـیان پێدڤیـە سـەربازی بکـات، ئـەوەی شـیانی هـەبێ و سـەربازی نەکات, نەك وەك باوەڕ پێ نەبوون، بەڵکو مژۆڵ بوون بەکاری خۆیان، ئەوا لە هەندێ سەردەمدا سەرانە لەو موسڵمانانەش وەرگیراوە, کە سـەربازیان نەکردووە. کەوابێ مەسـەلەکە زیـاتر پەیوەسـت بـووە بەسـەربازی نـەکردن، نەك سەرانە بدەن بەرامبەر بەوەی، کە هـەر بێ باوەڕ بن و "بیـت المـال"ی دەوڵەتی ئیسلام تژی بێ!

لە کاتی وڵاتگیری ئیـسلامیدا سـەرانە بـووە هـۆی ئـەوەی کۆمەڵگایـەکی نـوێ دروسـت ببـێ، کـاك شـوان لـە زۆر جـێ ئامـاژە بـە جزیـە دەکـات و واپیشان دەدات، کە ئەو سەرانەیە زیاتر بۆ دەڤەرەکانی دی بووە، ئەمـەش لـە ڕاستیدا هیچ بنەچەی نیـە، چونکە لـە دەوڵـەتی ئیـسلامدا، کە لەسـەر بنەمای باوەڕ دامەزراوە جیاوازی قەومیـەت و ناوچـەگەری،هیچ بەهایـەکی نیە.

جـار هـەبووە هۆزێك،یـان کۆمـەڵێك نەسـرانی, ئامـادەیی خـۆی پیـشان داوە بۆ شەڕکردن شان بە شـانی موسڵمانان بۆ بـەرگریکردن لـە سـنووری دەوڵـەتی ئیـسلامی، لەبـەر ئـەوە جزیـەی لەسـەر دانـەنراوە، نموونـەش بـۆ ئەمـە (جەراجیمـە)کـانن کـە لـە نزیـك ئەنتاکیـە نیشتەجێ بـوون (ئـاکنجی بوون)[1]، هـەروەها هـۆزێکی نەسـڕانی ئـاکنجی لەسـەر سـنووری باکووری

١- البلاذري، مصدر سابق، ص١٥٩.

وڵاتی فارس پەیمانی دا بە موسڵمانەکانەکە لە کاتی فتوحاتی ئیسلامی لە ساڵی ٢٢ك، ئامادەیە خزمەتی سەربازیی بکات، بەرامبەر بەمەش جزیەی لەسەر دانەنرا[١].

ئەو باج و سەرانەیەی وەردەگیریّ، هەر لە دەوڵەت و ڕەوشی باش کردنی کۆمەڵگای ئیسلامی خەرج کراوە، هەر بۆ نموونە: زۆربەی دەڤەری جەزیرە بە سوڵح و ئاشتی و دانی سەرانە ڕزگار کران، ئەگەر بە قسەی کاك شوان بیّ، دەبیّ سەرکردەکانی موسڵمانان لە جەزیرە زۆر زەنگین بوو بن. من تەنیا نموونەیەك دەهێنمەوە بۆ ئەوەی وەڵامی کاك شوان بدەمەوە:

(عومەیری کوڕی سەعدی ئەنصاری ئەوسی) والی (جزیرە)ی کوردستان و (حومص)ی سوریا بووە، لە پاش ڕزگارکردنی جزیرە، عومەری کوڕی خەتاب نامەی بۆ نووسی، کە ناوی هەژارەکانی ناوچەکەی بۆ بنووسیّ، عومەیری ئەنصاری والی جەزیرەی کوردستان،خۆی یەکیّ لەو هەژارانە بووە، کاتیّ عومەری کوڕی خەتاب ئەوە دەزانیّ سەد دیناری بۆ دەنێریّ، ئەویش ئەو سەد دینارەش بەسەر خەڵکی هەژاری ناوچەکە دابەش دەکات.. هەر ئەو والیە ناوچەکە لە ڕۆمانەکان دەسێنێتەوەو دەیداتەوە کوردان! [٢].

وەك وتمان سەرانە شێوازێکی نویّ لە بەرژەوەندی هەموو لایەك و، لە بەرژەوەندی ئیسلام دا بوو، چونکە ئەگەر مەسیحیەکان شەڕیان بکردبوایە، بێگومان موسڵمان دەکوژران، خەلیفە هەردەم دەیگوت گیانی

---

١ - الطبري، مصدر سابق، ج١،ص.

٢- حەسەن محمود، ل١٢٣، بلاذري،ص١٨٠.

موسڵمانان لەلام گرینگترە لە دەسکەوتی ماددی.

هەروەها چەند زیاتر خوێن لە نێوان هەردوو لا بڕێژرابایە پرۆژەی بە موسڵمانبوون درەنگتر دەبوو. ئیسلامیش موسڵمانبوونی مرۆڤ بەپێدڤیەکی زوو دەزانێ، لە بەرژەوەندی نا موسڵمانەکانیش دا بوو بەوەی گیان و ماڵ و موڵکیان لە کارەساتی شەڕ رزگاریان بوو. لەو پێودانگەوە دەکرێ بڵێین: سەرانە گەڕانەوە بوو بۆ عەقڵی مەعریفی و دایەلۆگ و پێکەوە ژیان و لەیەکتری حاڵی بوون.

دەوڵەتی ئیسلام هەتا لەبەراییی شاندی بۆ یەزگوردی ساسانیش نارد، کە ئیسلام قەبوڵ بکات، یاخود سەرانە بدات، ئەگەر ئەو دووە نەکات،با ئامادەبێ بۆ شەڕ. بەواتای هەتا دەرفەتی عەقڵ بووبێ،ئیسلام پەنای نەبردۆتە بەر شەڕ، بەحوکمی ئەوەی لە کوردستاندا زەردەشتی و مەسیحی و جولەکایەتی هەبوو، بۆیە دەرفەتی عەقڵ زیاتر لەئارادا بوو، هەر بۆیەش هەموو مێژوونووسانی ئیسلام باوەڕیان وایە کوردستان بە تایبەتی دەڤەری جزیرە بە ئاشتی و سوڵح لە دەسەڵاتی رۆمانەکان پاککراوەتەوە، کورد بەخۆهێشتنی خۆی قۆناغ بە قۆناغ، ئیسلامی قەبوڵ کردووە. ئەو ڕاستیەش لە تەواوی ژێدەرە مێژوویەکاندا تۆمار کراوە. رزگارکردنی شاری ئۆرفە و پەیمانی ئۆرفە، کە لەسەر بنەمایەکی ئایینی داڕێژراو بوو؛ سەرانە بەشێك بووە لەو پەیمانە و لە ئاکام زۆربەی هەرە زۆری شارەکانی دی دەڤەری جەزیرەی کوردستان رزگارکراون هەروەها زۆربەی مەسیحی و جولەکە و کوردەکان موسڵمان بوونە و لەناو کوردا بەبن دیان و بن جو ناسراون، ئەو موسڵمانبوونەش لە پێناو ڕزگاربوون لە

"جزیە" نیە وەك كاك شوان بۆی دەچیّ، بەڵكو پرۆفیسۆرێكی وەك (ول دیورانت) دەنووسیّ: موسڵمانەكان چاكتر بوون لە ڕۆم و فارس و، هەڵوێستیان نەرم بووە لە بەرامبەر جولەكە و مەسیحییەكان[1]. ئەگەر وانەبیّ خۆ ئەگەر جولەكە و مەسیحی و كورد لە ترسی جزیە ببانە موسڵمان، باریان گرانتر دەبوو! كە موسڵمان بوون، دەبوو وەك هەر موسڵمانێكی دی زەكات و صەدەقە بدەن، بڕی پارەی زەكات و صەدەقەش زۆر زۆرتر بووە لە بڕی پارەی سەرانە!! ئەمەش ئەوە دەگەیەنیّ وەك بڵێی كاك شوان بەشێوازێكی دۆنادۆن گەڕابێتەوە بۆ مێژووی چواردە سەدە بەر لەئێستا و دڵی ئەو جولەكە و مەسیحییە كوردانەی پشكنی بیّ بۆ ئەوەی ئەو واهیمەی خۆی بسەلمێنیّ. ئەمە لە لایەك، لەلایەكی تر كاك شوان، دەبیّ بزانیّ بڕی پارەی زەكات زیاترە لە بڕی پارەی سەرانە، جا ئەگەر مەسەلە ماددە بیّ، دەبوو هەرگیز ئەو كوردانە موسڵمان نەبان!!

ئەگەر مەسەلەی ترسی "عەرەبەكانیش" بوایە، دوبارە لە پاش نەمانی خەلافەتی راشیدی و دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی، كورد جارێكی تر هەموو هەڵگەڕابانەوە سەر زەردەشتیەت و ئاگر پەرستی و جولەكایەتی و مەسیحیایەتی!!

---

١- حەسەن محمود ل١٢٣، بلاذري ص١٨٠.

## بابەتی شەشەم

# هۆکارەکانی هەڵگەڕانەوەی شار و شارۆچکە کوردیەکان

کاک شوان لە لاپەڕە (٢٣٦) هەتا (٢٤١) بانگەشەی ئەوە دەکات، کە هۆکاری ئایینی و سیاسی و کولتووری و شارستانی و ئابوری و کۆمەڵایەتی، ڕۆڵی خۆیان بینیوە لە هەڵگەڕانەوەی کورد لە دژی دەسەڵاتی خەلافەت. پێش هەموو شتێ، هیچ ژێدەرێك لە ژێدەرە سەرەکیەکانی مێژووی ئیسلامیدا باس لە شتی ئاوا ناکەن، بۆیە کاك شوان خۆیشی جورئەت ناکات هیچ شتێ تەئویل بکات لە هۆکاری گیانی و ئاینی دەنووسێ: "کە کورد بەر لە ئیسلام (زەردەشتی) و (مەسیحی) بوونە"[1]. ئەم دوو دینەش بە دینی کورد ناو دەبات وەك دەنووسێ: ئاینەکانی کورد رەگێکی مێژوویی و گیانی و کۆن و قووڵیان لە دەروونی خەڵك دا هەبوو"[2]. هەرچی ئیسلام بوو وەك دەنووسێ: "لە زۆر لایەنەوە نامۆ بوو بە پێکهاتەی کولتووری و گیانی کۆمەڵگای کوردی، بۆیە ئەم هۆکارە، کاردانەوەیەکی گرنگی لای جەماوەری شار و شارۆچکە کوردییەکان دروست کرد و بوو بە بەشێك لە هۆکارەکانی ڕاپەڕین دژی دەوڵەتی خەلافەت"[3]. ئەگەر زەردەشتی و مەسیحی بەدینی ئاسمانی مابان، دەبوو پەیڕەوکەرانی ئەم دوو دینە زووتر موسڵمان بان، نەك وەك عەرەب درەنگ موسڵمان بان، لە (ئاڤێستا) و (ئینجیل)دا باسی هاتنی پێغەمبەری ئیسلام کراوە، بۆیە هەرسێ دین لە ڕووی عەقیدەوە یەك پێکهاتەی عەقیدەیی پێکدەهێنن، بەڵام وەك پێشتر

---

١- شوان عوسمان، کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد، ل٢٣٦.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٦.

٣- شوان عوسمان، ل٢٣٦.

باسمان کرد، زەردەشتی و مەسیحیەتی سەردەمی هاتنی ئیسلام، ئایینی ئاسمانی نەبوون، بەڵکو "دینی رەسمی دەوڵەت" بوون و، تەنها لە ڕاژەی دەسەڵاتی ساسانی و رۆمانیدا بوون. لەمەش زیاتر زەردەشتی ببوە (مەجوس) (ئاگر پەرست)، هەرچی مەسیحیەت بوو لەناو خودی خۆیدا تووشی هەقدژی ببوو، ئەمەو بتپەرستی بەشێکی گرنگی پێکهاتەی کەلتوری گەلانی ئێرانی بووە و، کورد زۆر درەنگ پەیڕەوی زەردەشتیەتی کردووە[1]. لە نەزەری ئێمە هۆکاری ئایینی و گیانی، هۆکارێك بووە بۆ پەیڕەوکەرانی رەسەنی زەردەشتیەت (نەك مەجوسی) و مەسیحی)، (نەك گاوری)، کە چاوەڕێی ئیسلام بکەن بۆ ئەوەی لە دەسەڵاتی دینی و قەومی ساسانی و رۆمانی ڕزگاریان ببێ. هیچ ژێدەرێك ئاماژە بۆ ئەو هۆکارە ناکات، کە کورد لە دژی خەلافەت "راپەڕیبن" بەڵکو لە دەسەڵاتی ساسانی و رۆمانی راپەڕیون!

لە هۆکاری سیاسیدا شتێ دەنووسێ، کە لە هیچ ژێدەرێك نەك باس نەکراوە، بەڵکو ئامارەشی بۆ نەکراوە، کاك شوان بانگەشەی ئەوە دەکات کە "زۆربەی شار و شارۆچکە کوردییەکان، چ ئەوانەی کەوتبوونە نێو سنوری دەوڵەتی ساسانی، یان ئەوانەی کەوتبوونە نێو سنوری دەسەڵاتی دەوڵەتی رۆمی بێزەنتی جۆرێك لەسەربەخۆییان بۆ خۆیان هێنابووە دی"[2]، کاك شوان، ئەگەر دەسەڵاتێکی کوردی لە هەردوو بەشی کوردستان سەربەخۆ بوویێ و خاوەن دینی خۆی بێ، دەبێ لەسەر چ بنەمایەك دەسەڵاتی دەوڵەتی ساسانی لە هەولێر بەرگەی میرنشینەکەی قەرەداغی نەگرتبێ؟! قەرەداغ، کە لە دەسەڵاتی مەجوسیەتی ساسانی هەڵگەڕاوە، خۆی و میرنشینەکەی

---

١- رەشاد میران، رەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، ل٢٦.

٢- شوان عوسمان، ل٢٣٧.

بوونە قوربانی!

بەڵام ئەگەر مەبەستی کاک شوان لە ئاغەیەک، دەرەبەگێک، یاخود موڵکدارێک لە شارێکی کوردی لە ژێر ئالای ساسانی، یاخود ڕۆمانی دەسەڵاتێکی ناوخۆیی بۆخۆی پێکهێنابێ، هەر لەسەر دینی ساسانی، یاخود ڕۆمانی بێ و باج و سەرانەی لە خەڵکی وەرگتبێ و بە دەوڵەتی ساسانی، یاخود ڕۆمانی دابێ، ئەوا لە مێژوودا دیاردەی وا هەیە، بەڵام عەرەبیش بەر لە ئیسلام لەم جۆرە دەسەڵاتانە بێ بەش نەبوونە. ئەوەتا دەوڵەتی مەنازیرە و غەساسینە و میرنشینی تەدمور و الحضر لە مێژوودا زۆر باس کراون.

عەرەب لە پێش ئیسلامدا دەسەڵاتێکی سیاسی و دینی بەهێزیان لە نیمچە دورگەی عەرەبیدا هەبووە، (بازاڕی عەکان)یش بەشێک لە مێژووی کەلتوری عەرەبی پێکدەهێنێ، بەڵام هەرگیز دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمانی ئەو دەرفەتەیان بەکورد نەداوە خاوەن دەسەڵاتی سیاسی و دینی و کەلتوری خۆیان بن. کاک شوان لە لاپەڕە (٢٣٨) مەبەستی خۆی لەمەڕ ئەم هۆکارە دەخاتە ڕوو و دەنووسێ: ".. ئەمە بووە هۆی لەدەست دانی دەسەڵاتی نێوخۆیی و نیمچە سەربەخۆییەکانیان".

بەڵام ڕاستی تەواو؛ پێچەوانەی ئەمەیە، چونکە کە لەشکری ئیسلام هاتە کوردستان وەک (طبري) و (إبن الاثير) و (بەلازری).. دەنووسن، لە زۆر شوێن کورد کراون بەسەرداری شارەکانیان، بەواتای پرۆسەی بە ئیسلام بوونی کورد هۆکارێک بووە بۆ دروست بوونی کیانێکی کوردی ئیسلامی[1]!.

---

١- کاک شوان خۆیشی باسی میر قوباد دەکات، کەبۆتە سەرداری حەلوان، بەڵام وادیارە کاک شوان کە باسی شتێک لە شوێنێک دەکا لەبیری دەچێ لە شوێنێکی تر چی نووسیوە!

کورد و عەرەب پێش ئیسلام لە نەزەری ئیسلام خاوەن کەلتورێکی جاهیلی بوون. لە قورئاندا باسی ئەوە هاتووە کە کۆچەرەکانو رەوەندەکان، دواکەوتوون، بە بەراورد لەگەڵ شارییەکان کافرتر و دووڕوو ترن. ئەگەر بەشێك لە کۆمەڵگای عەرەبی کۆچەری و رەوەند و دەوارنشین بووبن (کە وابوون)، کوردیش بە قەوڵی ڕەشاد میران، کۆچەر و شوانکار و چیایی بوونە[1]. لە نەزەری کاك شوان فاکتەری کولتوری و شارستانیی، ڕۆڵی خۆی بینیوە لە هەڵگەڕانەوەی کورد (کە شارستانی بوونە) لە دژی دەسەلاتی خەلافەت، (چونکە عەرەبەکان دەوارنشین بوونە!) لێرەدا کاك شوان کاریگەری ئیسلام لەسەر هزر و رەفتاری عەرەبە موسڵمانەکان دەسڕێتەوە، بەڵکو واپیشاندەدات، کە عەرەبەکان "ئیسلامیان" بۆ بەرژەوەندی عەرەبایەتی قۆرخ کردوە.

هیچ کەس ناتوانێ نکوڵی لەوە بکات، کە ئیسلام شۆڕشێکی عەقیدەیی و هزری و کەلتوری گرنگی لەنێو موسڵمانان بەرپا کردوە و،بەسەر کەلتوری رەوەندی کۆچەری زاڵ بووە و، عەقڵیەتێکی مەعریفی شارستانی دامەزراندوە. هەر ئەمەش وای کردووە بەئاسانی قەبوڵی ئەو دەسەلاتە –هابیلییەی– ئیسلام بکات و ببێتە بەشێك لە ئوممەی ئیسلامی. کاك شوان لە ڕوانگەی راڤەی ماددی بۆ مێژوو، هۆکاری ئابووری دەکاتە هۆکارێك بۆ بلاوکردنەوەی ئیسلام لە دەرەوەی نیمچە دوورگەی عەرەبی،وەك بڵێی ئیسلام هاتووە باجێکی زۆری بەسەر کورددا سەپاندوە. کوردیش کە دەرفەتی بۆ رێکەوتوە بۆ لابردنی ئەو بارگرانییە،لە دژی ئیسلام راپەڕیوە! ئەمە هەر رای کاك شوان نیە، بەڵکو پێش ئەو، رۆژهەلاتناسەکان زۆر زوو ئەمەیان وروژاندوە. هەروەها رەفیق سابیر و (ج. کوردۆ) ئەمەیان دوبارە

---

١- ڕەشاد میران، ل٢٦-٢٧.

کردۆتەوە، بۆیە ئەوەی کاک شوان (تەقلیدی تەقلیدە!)، لە کۆن و نوییێ دا باج هەبووە، بەڵام باجی ئیسلام لەسەر هەندێ مرۆڤ بۆ بەرژەوەندی مرۆڤە پێویستەکان و دەوڵەتی ئیسلامی بووە, کە رەمز و ماڵی هەموو موسڵمانێکە، ئەمڕۆ لە ئەوروپا زۆر دەوڵەت لەسەر باج tax دەژین و مەسەلەی باج بەدیاردەیەکی شارستانی دادەنێن!!

هەروەها کاک شوان بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە لە نەزەری عەرەبە موسڵمانەکان عەرەبایەتی لە پێش ئیسلامەتی بووە بۆ یەکسانی غەیرە عەرەب، بۆ نموونە کورد، "ئەگەر موسڵمانیش ببان هیچ شتێکی ئەو تۆی نەدەگۆڕی، بەڵکو دەبوایە عەرەب بێت بۆ ئەوەی رێز و حورمەت و تایبەتمەندێتی ئابوری و رامیاریشت هەبێت[1]، مێژووی رەگەز پەسەندی هێندە کۆن نیە، هەروەها عەرەبایەتی هێندە پەسەند نەبووە، تاکو عەرەب شانازی پێوە بکەن، جا عەرەبە موسڵمانەکان بەچ پێوەرێک لەسەر ئەو مەسەلەیە کاریان کردووە؟! من لەوانە نیم، مێژووی مرۆڤایەتی بەپیرۆز ببینم، مادام مێژوو مرۆڤکردە بێ، حەتمەن چاوەڕێی شتی جیاوازی لێ دەکرێ، کەوابێ خودی مەسەلەکە رێژەییە و موتڵەق و رەها نیە. ئەو عەرەبە موسڵمانانەی لە سوپا و کارگێڕی ئیسلامیدا کار بەدەست بوون، لە مێژ بوو لە نەفامی عەرەبێتی شورابوونەوە، ئەوانەی هەر لە بازنەی ئەو جاهیلیەتە دا بوون, هیچ پلە و پایەکیان نەبووە، لەم رووەش هیچ ژێدەرێک نیە باس لە ناکۆکی و ململانێ و شەڕێ بکات، کە لەسەر بنەمای "عەرەبایەتی-کوردایەتی" لە دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامیدا بەرپا بووبێ!!

---

١- شوان عوسمان، ل٢٤١.

# چەند سەرنجێك لەبارەی هەڵگەڕانەوەو ڕاپەڕینی شارو شارۆچکە کوردییەکان

بەر لە هەموو شتیێ "هەڵگەڕانەوە" و "ڕاپەڕین" دوو دیاردەی سروشتی هەر کۆمەڵگەیەکی نێوان چەند دەسەڵاتێك و پڕ لە ململانێن.

عەرەب پێش کورد لە دەسەڵاتی خەلافەت هەڵگەڕاونەتەوە، لە پاڵ هەڵگەڕانەوەش بانگەشەی "پێغەمبەرایەتیشیان" کردووە، لەو دەڤەرەی خۆیان دەسەڵاتێکیشیان بۆ خۆیان پێکەوە ناوە، دەبێ ئەوانە بۆ چ هەڵگەڕابنەوە؟ خۆ ئەگەر مەسەلە "قەومی" بێ هەردوولا عەرەب بوونە؟! ئەو جۆرە هەڵگەڕانەوەش درێکی کوشندە لە "یەکێتی نەتەوەیی" دەدەن؟! ئایا هۆکاری دینی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی -کەلتوری لە پاڵ ئەو هەڵگەڕانەوە دابوونە؟! ئەریێ کێشەیەکی مەعریفی و هزری لەگۆڕێ دابووە، یاخود مەسەلەکە هەمووی کەلکەلەی دەسەڵات بووە؟!

لە سەردەمی "فتوحات"دا زۆربەی ئارێشەکانی ئەوسا لە چوارچێوەی دەسەڵات دابوون، لەناو خودی هەردوو دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمانیدا چەندەها کێشە لەئارادا بوون، زۆربەی هەرە زۆری لە دەسەڵاتخوازی زێتر نەبوون، ئەریێ لە ئەصڵدا شەڕی چەند سەدەی ساسانی و ڕۆمانی دینی و نەتەوەیی بوو، یاخود پاوانخوازی دەسەڵاتی عەسکەری و جوگرافی بوو؟!

بابزانین ئەو دیاردەیە لە دەڤەری کوردیدا چۆن بووە. لە بەرایی وتمان هەندێ نوسەر بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە دەوڵەتی ساسانی دەوڵەتێکی کوردی بووە، کەسانی وەك کاك (شوان)یش بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە

کورد لەناو دەسەڵاتی ساسانیدا پێگەیەکی سیاسی و ئیداری و دینی هەبووە، بەشداری کوردیش لە لەشکری ساسانی بەشێك بووە لە سەروەری کورد، وەك بڵێی نەمانی دەوڵەتی ساسانی لەنەزەر کاك شوان بە کارەسات و نەهامەتی بەسەر کورد دا شکاوەتەوە، بۆیە کە دەسەڵاتی ساسانیش لە دەڤەرەکەدا نەماوە, هەر کورد بەرەنگاری لەشکری ئیسلام بۆتەوە؟!

لەمەش زیاتر، کاك شوان هەڵگەڕانەوەی کورد لە دژی دەسەڵاتی دەوڵەتی خەلافەت وەك هی عەرەبەکان, تاك رەهەند نابینێ، بەڵکو بە عەقڵیەتی ئەمڕۆ "شرۆڤە"ی ئەو ڕوداوانە دەکات!

هەڵگەڕانەوە لەدەسەڵاتی تازە دیاردەیەکی نا سروشتی نیە، هەرێمی کوردی بە بەراورد لەگەڵ هەرێمی عەرەبی زۆربەی بە ئاشتی و سوڵح ڕزگار کراوە. لە هەرێمی کوردیش دوو دەسەڵاتی مەزن هەبوون, هەردووك وڵاتی کوردیان کردبووە بەشێك لە ستراتیژیەتی خۆیان. هەڵکەوتەی جوگرافی کوردستان گرنگییەکی جیۆپۆلیتیکی لە دوریانی دەوڵەتی ساسانی و ڕۆمانی دا هەبووە، بۆیە چەند فاکتەری کورد رۆڵی خۆی ببینێ لە ململانێی ئیسلام–ساسانی، ئیسلام –ڕۆمانی، مەسەلەکە بە بەرژەوەندی ساسانی و رۆمانی تەواو بووە،جا چەند دەسەڵاتی رۆمانی یاخود ساسانی لەو دەڤەرانەی کوردیدا نزیك بووبن، توانیویانە ئاژێشە و پەشێوی لە دەڤەری کوردیدا بەرپا بکەن. کاك شوان خۆیشی ناتوانێ نکوولی لە هەندێ لەو ڕووداوانە بکات، کە بەپاڵپشتی دەسەڵاتی رۆمانی، یاخود ساسانی بووە، لە مێژووی ململانێی ساسانی–ڕۆمانی، هەرێمی ئەرمینیا خاڵێکی گرنگی ململانێیەکە بووە هەر، کە ساسانییەکان بەهێز

بوونە، دەوڵەتێكی سەربەخۆیان لەوێ دامەزراندووە، بەڵام هەركە لاواز بووینە، ڕۆمانیەكان دەرفەتیان وەرگرتووە پیاوێكی خۆیان كردۆتە سەرداری ئەو هەرێمە. وێڕای كێشەی سیاسی، زەمەنێك ناكۆكی دینی-یش بۆتە فاكتەرێكی ململانێی هەردوولا، هەر كە ئەو هەرێمە كەوتە بەر دەست لەشكری ئیسلام، بەحوكمی ئەوەی هێشتا پیاوانی ڕۆم لە هەرێمەكەدا هەبوون، كە زۆربەی موڵكداری هەرێمەكە بوون، هەروەها بنەماكانی ئیسلام تەواو بنجی خۆی دانەكوتا بوو، بۆیە هەرێمی ئەرمینیا بەهاوكاری دەوڵەتی ڕۆمی بێزەنتی لە دەسەڵاتی دەوڵەتی خەلافەت ڕاپەڕین و توانیان بۆ ماوەیەك سەربەخۆ بن. ئەمەش پتر كاریگەری ئاینی و ڕامیاری لەپشتەوە بووە[1]، هەرچی هەرێمی فارس و ئەهوازە، كورد لەو دوو دەڤەرەدا بەشێك نەبووە لە پێكهاتەی كۆمەڵگەی مەدەنی ئەو دوو هەرێمەدا، بەڵكو دەوارنشین و كۆچەر بووە. مێژوونووسان دەنووسن، كە لە هەرێمی فارس چوار (یان پێنج) زۆمی كورد هەبوونە و هەروەها هۆبەی (گەڕەكی) كوردیش هەبوون، ئەوانە زیاتر لە ژێر كاریگەری دەوڵەت دابوونە، بەرژەوەندی سەرۆك قەبیلە و سەرداری هۆبەكان (نەك تاكی كورد) لەگەڵ بەرژەوەندی دەوڵەت دا بووە، دوور نییە زۆربەی ئەو كوردانەی لە لەشكری ساسانیدا بوون، كە لەنەزەری كاك شوان پێكهاتەی سەرەكی لەشكری دەوڵەتی ساسانی بوون[2]، هەر كوردەكانی ئەو زۆم و هۆبانە بووبن.

هەرچی ئەو ڕوداوانەن، كە لەكاتی فتوحات و ماوەیەك دوای فتوحات

---

١- شوان عوسمان،ل٢٤٩.

٢- شوان عوسمان،ل١٥٠.

ڕوویانداوە، هیچ ئەگەرێکی سیاسی و ئاینی و کەلتوری و ئابووری لە دواوە نەبووە، بەڵکو، کە لەڕووداوەکان ورد دەبینەوە زیاتر کێشەی کەسیی و بەرژەوەندی موڵکدارەکان بووە، لە هەندێ ئەو ڕووداوانە کاك شوان پشت لە زۆربەی ژێدەرەکان دەکات، پشت تەنها بەو ژێدەرە دەبەستێ، کە لە بەرژەوەندی ئەو دابێ، هەر بۆ نموونە دەربارەی "هەڵگەڕانەوەی" شاری هەمەدان دەنووسێ" (زۆربەی سەرچاوەکان) لەسەر ئەوە کۆکن کە شاری هەمەدان ڕاستەوخۆ دوای شەڕی نەهاوەند، لە ٢١ك/٦٤٤ز دا لە لایەن لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان گیاوە، لەگەڵ ئەوەشدا چەند سەرچاوەیەك باس لەوە دەکەن، شاری هەمەدان ساڵی ٢٣ك/٦٤٤ز، و ساڵی ٢٤ك/٦٤٥ز گیاوەتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە هەمەدان دوو جار دژی عەرەبە موسڵمانەکان ڕاپەڕیوە، بەڵام هەردوو جارەکە خراوەتەوە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی خەلافەت."[1]!

سەبارەت بە هەڵگەڕانەوەی شارەکانی هەرێمی جزیرەی کوردستان، کاك شوان بە ئارەزووی خۆی کەوتۆتە شرۆڤە کردنی ڕوداوەکان، لەگەڵ ئەوەش لە زۆرجێ ناتوانێ نکوڵی لەو ڕاستییە بکات، کە هەر کێشەیەك لە هەرێمەکەدا بەرپا بووبێ دەستی ڕۆمە بیزەنتیەکانی لە پشتەوە بووە.

لەو بەشەدا باسی شەش شار دەکات و ئەوەی "ئۆرفە" بە "ڕاپەڕین" حسێب دەکات و (ئامەد) و (شمیشات) و (مەلاتیە) و (دەڤەری موسڵ) بە هەڵگەڕانەوە، ئەوەی (شارەزووریش) بە (چش!).

هەموو سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن، کە شاری "ئۆرفە" بەسوڵح لەگەڵ موسڵمانەکان ڕێککەوتون، هەتا کاك شوان خۆیشی دان بەو ڕێککەوتنە دا دەنێ، تەنانەت سەرکردەی موسڵمانان لەناوچەکە نەچۆتە

---

١- سەرچاوەی پێشوو.

کەنیسەی شارەکەش،کەچی کاك شوان قسەی (بەلازری) لە (فتوح البلدان-ل١٨٠) و (قدامە بن جعفر) لە (الخراج و صناعة الكتابة-ل٣١٣) وا راڤە دەکات, وەك بڵێی شارەکە پێشتر لە ڕووی عەسکەرییەوە گیراوە و خەڵکەکە لە دژی ئەو دەسەڵاتە راپەڕیون و جارێکی تر موسڵمانەکان شارەکەیان گرتۆتەوە! کاك شوان دەڵێ:"هەندێ لە سەرچاوەکان راپەڕینی شارەکان بە (تکفیر) لە قەڵەم دەدەن[1]"، هەر کاك شوان لە هەمان لاپەڕەدا پێی سەیرە, کە چۆن "سەرچاوەکان باسی کاردانەوەی توند و تیژی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان بەرامبەر دانیشتوانی ئەم شارە ناکەن[2]"، کاك شوان دەزانێ بۆچی باس ناکەن، چونکە دانیشتوانی شاری ئۆرفە هیچ "راپەڕینێکیان" لە دژی لەشکری ئیسلام نەکردوە، جا چۆن لە گەڵیان توند و تیژبن؟!

لە باسی "هەڵگەڕانەوەی" شاری (ئامەد)یش کاك شوان دەنووسێ: لەگەڵ ئەوەش دا دەشێ دەر ئەنجامی ئۆرفە و شارەکانی هەرێمی جەزیرە و شاری ئامێدیش هەڵگەڕابێتەوە و، یاخود لەسەردەمێکی لە دواتردا راپەڕی بن.[3]

کاك شوان، ئەمە مێژووە، نەك "پێشبینی" بێ بنەما، ئەگەر شتێکی ئاوا روویدابا، حەتمەن سەرچاوەکان باسیان دەکرد و دەرفەتییان بەتۆ نەدەدا تۆ پێشبینی بکەی!! بێگومان هەڵگەڕانەوە و راپەڕین روویندەداوە، جا چۆن باسی بکەن.. دەبێ ئەوانیش وەك تۆ بکەن واز لە ئەکادیمیەت بێنن و راپەڕین و هەڵگەڕانەوە لەواهیمەی خۆیان بەرپا بکەن؟!

لە "هەڵگەڕانەوەی" شاری "شمیشات" دەنووسێ: "بە بۆچوونی ئێمە

---

١- شوان عوسمان، ٢٥٠.

٢- سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

٣- شوان عوسمان، ل٢٥٢.

هۆکاری ڕامیاری کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبووە، چونکە هاوسنووری (بێزەنتە) بووە و هانی داوە، هاوکات ماوەیەکی دووریش نەبوو،کە لە دەست ڕۆمەکان دەرچوو بوو.[1]

لە بارەی هەڵگەڕانەوەی مەلاتیە دەنووسێ: "دەوڵەتی ڕۆمی بێزەنتی هاوکاری و کۆمەکی نەدەکردن."[2] بە بۆچوونی کاك شوان دەوڵەتی ڕۆمی بێزەنتی پشتگیری هەڵگەڕانەوەی شاری شمیشاتی کردووە، بەڵام هاوکاری و کۆمەکی شاری مەلاتیەی نەکردووە؟!

کاك شوان، دەبێ لەبەر چی بووبێ؟ چۆنە ئەمجارە شتێکی تر "پێشبینی" ناکەی؟!

کاك شوان لەمەڕ هەڵگەڕانەوەی "دەڤەری موسڵ و شارە پێوەستەکانی" تەنیا باسی شاری مووسڵ دەکات. لەبارەی هەڵگەڕانەوەی شاری موسڵیش تەنیا ڕای "دوو نووسەری نوێ" نەك مێژوونووسانی ئیسلامی دەهێنێتەوە، لەسەر ڕای ئەوان "گومان"ێك دروست دەکات دەڵێ: لەوانەیە! موسڵ دووجار گیرابێ! هەرچی (واقیدی)یە باسی پەشیمان بوونەوەی حاکیمی نوێی موسڵ دەکات،نەك خەڵکی موسڵ!

لە بارەی (دەڤەری شارەزوور) کاك شوان (ڕاستییەکی تاڵ بۆخۆی!) تۆمار دەکا و دەنووسێ: "هەرچەندە سەرچاوەکان باس لەوە ناکەن، کە دەڤەری شارەزور لە دەسەڵاتی عەرەبە موسڵمانەکان هەڵگەڕابێتەوە، لەگەڵ ئەوەش دا تاماوەیەکی درەنگ نەیانتوانی بەتەواوی دەست بەسەر ئەو دەڤەرە دابگرن و دەسەڵات و ئاینی خۆیانیان بەسەردا بسەپێنن."[3]

---

١- سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

٢ - شوان عوسمان، ل٢٥٣.

٣- شوان عوسمان، ل٢٥٤.

ئەریٚ کاك شوان، بەڕاستی سەرچاوەکان باسی ڕاپەڕینی دەڤەری شارەزوور ناکەن، یاخود چونکە ڕاپەڕینەکە لە دژی دەسەلاٌتی دەوڵەتی ساسانی بووە، نەك دەسەلاٌتی دەوڵەتی خەلافەت، بۆیە تۆ ئاماژەی پێناکەی؟! کاك شوان، ڕاپەڕینی دەڤەری شارەزوور یەکیٚ لەو ڕاپەڕینانەیە لە دژی داگیرکەری ساسانی، نەك سەرچاوە کۆنەکان، بەڵکو نوێیەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن، کە کورد زۆر نارەحەت بوونە لە دەست دەوڵەتی ساسانی!؟

هەروەها ڕێزدار عەبدولحەمید حسێن لە (الفتح الاسلامي في العراق و الجزيرة) (ل١٧٧ و١٣١) دەنووسیٚ: ئەوانەی ناسراون بە "حومڕای دێلم" ئەو سەربازە کوردانەی لەشکری ساسانین و لە دژی دەوڵەتی ساسانی ڕاپەڕیون، نەك پاڵپشتی لەشکری ساسانی بوونە، وەك تۆ دەڵێی. هەروەها د.عبدالله موستەفا هەر لەهەمان سەرچاوەدا ئەو ڕاستییە لە بارەی بێزاری سەربازانی کورد لە لەشکری ساسانی دا دەگوازێتەوە.[١] لە ئاکامیش ئەو کوردانە پەیوەندیان بە سوپای عەرەبە موسڵمانەکانەوە کردووە و بوونەتە پاڵپشتێکی بەهێزی ئیسلام، هەر لە ڕێگای ئەوانەشەوە پرۆسەی وڵاتگیری بە ئاسانی مەیسەر بووە.

کاك شوان، تۆ باسی ئەکادیمیەت و میتۆدی توێژینەوەی مێژوویی دەکەی، دەبوو باسی ئەو ڕاپەڕین و هەڵگەڕانەوانەشت بکردبا، کە لەدژی دەسەلاٌتی ساسانی و ڕۆمانی بەرپا بوونە، نەك وەك هەندیٚ نووسەر و ڕۆژهەلاٌتناس بە وردبین لەدوای کێشەیەك بگەڕێی ناوی بنێی هەڵگەڕانەوە، یاخود ڕاپەڕین، چونکە ئەمانە لە کاری ئەکادیمیدا ئەوها ئاسان نین وەك تۆ لێی حاڵی بووی!

---

١- د.عبدالله مصطفى: امجاد الاكراد، ص٤٣-٤٤.

# لە ئەفسانەکانی بەشێك لە سیکۆلاریزمی کوردی ئەفسانەی نووسینی سەر پێستەکە بە نموونە

## دەروازەیەك:

زۆر پرس و مەسەلە لێرەو لەوێ دەوروژێنرێن لەمیانەیاندا ڕەخنە لە ئایین و هەژموونی کەلتوری کوردی دەگیرێ. زۆرێك لەوپرس و باسانەش هێندە بێ بنەماو بەڵگەن، بۆسەردەمێکی وەك ئەمڕۆ لە (ئەفسانە) و (حەکایەتی بەرئاگردان) دەچن!

هەبوونی پێستێك، چەرمێك، کەوڵێك، کەچەند دێرەشیعرێکی لەسەر نووسراوە و ڕەخنە لە ڕەفتار و گوفتاری موسڵمانە بەراییەکان لە کوردستان دەگرێ، یەکێ لەوپرسانەیە ،کە زیاتر لە سێ چارەگە سەدەیە (١٩٣٠-٢٠٠٩) لە دەرفەتی جیاجیا بەشێك لە ڕاگەیاندنی سیکۆلاریزمی کوردی، دەیوروژێنێ!

ئەم نووسینە هەوڵدانێکە بۆ تاوتوێکردنی ئەم بابەتە، خوێندنەوەی دەقە شیعریەکە و، شرۆڤەکردنی لەسەر چەند بنەمایەکی ئەکادیمی، وەك بنەمای زمان – زمانی شیعرەکە پەهلەوی، یان گۆران، هەورامانی! هەروەها قسەکردن لەسەر وشەو پەیڤەکانی شیعرەکە و خوێندنەوەی ئەو پرسە لەسەر بنەماکانی گۆڕانی زمان – بنەمای ئایینی، خوێندنەوەی بۆ شەڕ و ئاکامی شەڕ و قسەکردن لەسەر مەسەلەی ئەنفال، چونکە ئەدەبیاتی بەعس و بەشێك لە ڕاگەیاندنی سیکۆلاریزمی کوردی هەردەم لە پێکۆڵ (هەوڵ) دابوونە بۆئەوەی نەوەی نوێ ی کوردی لاڕێ بکەن لە ئایین

و مێـژوو و نەتەوەکـەی! مێـژوو بنەمایـەکی تـرە کەقسـەی لەسـەر کـراوە. لەدەقەکەدا ناوی (شارەزوور) هاتووە، هەروەها بانگەشەی ئەوەکراوە، کە یەکەم شـەڕی موسـڵمان و (کـورد) لـە شـارەزوور بـووە! لـەم بەشـەدا، قسە لەسەر مێژووی شارەزوور کراوە و بەبەڵگە ئەوە خراوەتە ڕوو، کە ئەوسا کورد شارێکی نەبووە بەناوی شارەزوور!!!

وێـڕای ئەمانـەش، چـەندەها بەڵگـەی تـر هێنراونەتـەوە بۆئـەوەی مەسـەلەی ئەو پارچە پێستە هەڵبوەشێتەوە, هەرلەناو خودی دەقەکەدا چەند مەسەلەیەك هەن دەقەکە هەڵدەوەشێننەوە! ئەو هەموو باسانە، لەژێر ناونیـشانی چـەند سەرباسـێك قـسەیان لەسـەر کـراوە، بۆئـەوەی هـەم نوسـینەکە شـێوەیەکی ئـەکادیمی وەربگـرێ و هـەمیش خوێنـەر لـە خوێندنەوەی چێژ وەربگرێ، تەرکیز(جەخت) – لەسەر مەسەلەکە بکات.

# ئەفسانەی پێستەکە

## چیرۆکی دۆزینەوەی پێستەکە:

ئەوەندە ژێدەرو سەرچاوەیەم لەبارەی ئەو پێستە و مێژووی نووسین و (دۆزینەوەی) لەسەرچاوەی (حوسێن حوزنی موکریانی)م کۆنتر نەدۆزییەوە، حوسێن حوزنی موکریانی لە ژمارە (٢١)ی گۆڤاری زاری کرمانجی ڕێکەوتی (٦)ی نیسانی ١٩٣٠، لەلاپەڕە (١٩) لە کورتە وتارێك بە ناونیشانی "سەرمایەکی گران بەهای مێژووی کوردان" سەربردەی پێستەکە ئەوها دەگێڕێتەوە:" لە عصری حەزرەتی عومەر سالّی نۆزدەی هیجری، شاعیرێکی کورد لەڕووی دڵگیری و سوکایەتی کوردانەوە هەڵی بەستووە. گەڕۆکێکی ئینگلیز لە سلێمانی دەروێشێکی دی لە کوچەیەکدا ڕوونیشتووە دەورپشتی پڕ لە ژن وەستاون. ئەویش سەری خۆی دەباتە پێشەوە تەماشا دەکا بەخەتی پەهلەوی کۆن لە پارچە کاغەزان دەنوسێت و دەداتە ژنەکان. گەڕۆکەکە لەوە دادەمێنێت ، کە دەروێش چۆن لەخەتی پەهلەوی دەگات! دەڵێ: بابە دەروێش تۆئەم نوسراوە لە کوێ فێربووی؟ دەروێش دەڵێ: کتێبێکم هەیە لەڕووی ئەو شکڵ نویس دەکەم – پیاوەکە دەڵێ: کوانێ پێم نیشان بدە. دەروێش لەهەمبانەکەی پارچە کەوڵێك دەردەخاو دەیداتە دەست کابرا. ئەویش لێ ی ورد دەبێتەوە و دەبینێ ئەوە چوار شیعری کوردی بەزمانی کۆن بەخەتی پەهلەوییە، دەروێش دەیکاتە نوشتە و دەیدا بە ژنان."

سەدیق بۆرەکەیی چیرۆکێکی تر لەبارەی دۆزینەوەی ئەو پارچە چەرمە دەگێڕێتەوە:" وەکو ئەڵێن ئیبراهیم پاشای بابان (١١٩٨-١٢١٨)ی

کۆچی کەلەساڵی (١١٩٩)ی کۆچی دا کاتێ شاری سلێمانی ئاوەدان کردەوە لەکاتی هەڵکۆڵینی شارەکەدا کرێکارەکان پارچە چەرمێکیان دۆزیەوە لەبەر ئەوەی نرخی ئەوەیان نەئەزانی بەپارەیەکی کەم فرۆشتیانە لاوێکی ئینگلیزی و ئەویش ئەوپارچە چەرمەی بەرەو لەندەن برد و پاشان دەرکەوت کەلەوەدا پارچە هەڵبەستێك بەخەتی پەهلەوی نووسراوە، ئەوسا ئەو پارچە هەڵبەستەیان نارده ڕۆژنامەی (خۆرهەڵات) بڵاویان کردەوە، لەپاشان مامۆستا حەمە تەقی بەهار (١٠٣٨-١٣٧٢)ی کۆچی بۆ دووەمین جار ئەو پارچە هەڵبەستەی لەساڵی (١٣١٦)ی هەتاوی لە گۆڤاری (مێم) دا بڵاوکردەوە." لە "دۆزینەوەی" ئەوپارچە پێستەدا هەردوو سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئەوپارچە پێستە بە گەڕۆکێکی ئینگلیزی دراوە! سەرچاوەی سێ یەم، کەباسی ئەو پارچە پێستەی کردبێ کتێبەکەی (ڕەشید یاسمی) یە بەناوی "مێژووی نەژاد و پەیوەستەگی کورد" ئەو کتێبەی ڕەشید یاسمی بەفارسی نووسراوە، هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن، کە ڕەشید یاسمی ئەوکتێبەی بە ڕێنمایی دەزگای (ساواك)ی ئێرانی نووسیوە. هەندێ نووسەری کورد وەك عەلائەدینی سەجادی ڕاستەوخۆ ئەو چیرۆکەی لە دەقە فارسیەکەی ڕەشید یاسمی وەرگرتووە، بەڵام نووسەرانی دی کورد دەقەکەیان ، یان لە وەرگێڕانی کتێبەکەی ڕەشید یاسمی وەرگرتووە ، یان لە کتێبەکەی عەلائەدین سەجادی!

**ئاما نجەكانی بڵاوكردنەوەی شیعری سەر پێستەكە:** هەردەقێك، بەگوێرەی میتۆدە ڕەخنەیی یەكان زیاتر لە تەئویل و خوێندنەوەیەك هەڵدەگرێ. ئەو دەقەش چەند ئامانجێكی دیاریكراوی هەیە، بەڵام هەموو ئەوانەی قسەیان لەسەر ئەو دەقە كردووە هاوئامانج نەبوونە! لەدەستپێك دا هەوڵ دەدەین پۆلێنێك بۆ ئامانجی نووسەرانی كورد بكەین، چونكە وەكو وتمان هەموو بۆیەك مەبەست و ئامانج بەكاریان نەهێناوە. پۆلێنەكە بەپێی ئامانجەكە دادەڕێژین.

**یەكەم: ئاشكراكردنی ئیسلام:** بەڕای من ئەو دەقە، د. سعید خانی كوردستانی بۆ حوسێن حوزنی موكریانی ناردووە، ئەو ڕاستیەش هەرلەگۆڤاری زاری كرمانجی ئامارژەی پێكراوە. هەروەها سەدیق بۆرەكەیی لەبەرگی یەكەمی كتێبی مێژووی وێژەیی كوردی، لەلاپەڕە (٣٨) دەنوسێ: "لەسەر قسەی مامۆستا دوكتۆر سعید خانی كوردستانی نزیكەی سەد ساڵ لەمەو پێش پارچە چەرمێك لە ئەشكەوتی (جێشانە)ی سلێمانی دا دۆزراوەتەوە، كەچەند هۆنراوەیەكی بەزاراوەی گۆرانی تێدا نووسراوە، گوایە لەوسەردەمەدا ، كە موسڵمانان شارەزوور و دۆكانی دەورووبەری داگیر دەكەن ، ئەم هۆنراوانە چۆنیەتیەكی ئەو دەمە دەگێڕێتەوە".

هەروەها سەدیق بۆرەكەیی لە كتێبێكی دەستنووسی دا دووبارە دەنووسێ: "دوكتۆر سعید خانی كوردستانی ١٢٧٩-١٣٥٨ ی كۆچی ، كە خۆی ئەم پارچە هەڵبەستەی دیوە لەپەرتوكی (نزانی) - مزرگانی دا ئەڵێ: لەم دوایەدا پارچە چەرمێك لە سلێمانی دا بەخەتی پەهلەوی

دۆزراوەتەوە، کە داگری چەند هۆنراوەیەکە بەشێوەی هۆنراوەکانی (بابە تاهیر) و (سان سەهاك) و (پیرنیامیش) و (پیر داود) و (پیر موسا) داڕێژراوە ..." ئەمەو، د. جەمال نەبەز یش دەڵێ: هۆنراوەی هور مزگان، یەکەم کەس، کەباسی لێوە کردووە،دوکتۆر سعید خانی کوردستانییە..".

حوسێن حوزنی موکریانی هەر لە ڕستەی یەکەمی کورتە وتارەکە دا دەنوسێ: "لە عەسری حەزرەتی عومەر لە سالی نۆزدەی هیجری، شاعیرێکی کورد لە ڕووی دلگیری و سوکایەتی کوردانەوە ... شیعری مزرگانی هەڵبەستووە".

محمد ئەمین هەورامانی لە کتێبێکی مێژوویی ڕێبازی زمانی کوردی "دەقی مزرگانی هێناوەتەوە و بەدەقێکی دینی جەماوەری ناوزەدی کردووە . هەروەها لە کتێبی "بەراوردی نێوان زمانی کوردی و ئاڤێستا لە لاپەڕە (٣١) هەر لەو بارەیەوە دەنووسێ: "لە ناوچەی (قەزوێن) دا، لەسەردەمی خەلیفەی دووەمی ئیسلام دا، کاتێك، کەلەشکری ئیسلام دەچێتە ئەوێ، زۆر و جەور بەکار دەمێنن، خەڵکەکە، بەخۆپیشاندانێکی گەورە، ناڕەزایی خۆیان، بەرامبەر ئەو بەزۆر خۆسەپاندنەیان دەردەبڕن و بەم دێڕە هۆنراوەیە، دروشم دەخوێننەوە ئەویش، یەژێ:

نە موسڵمان بم، نە گزیەت مەدەیم
پشێن وە مەککە، ئێمە وەڕ هەیم

بە واتای:

"نە موسڵمان دەبم، نە سەرانە دەدەم
بڕۆنەوە مەککە، ئێمە لێرە ناجوڵێن"

ڕەشید یاسمی لە کتێبی (نەژاد و پەی وەستەگی کورد) وەرگێڕانی کەریم زەند و قانع، لاپەڕە (٨١) لە ژێر سەردێری "ئایین و باوەڕ" جگە

لەوەی (کورد و فارس) بەیەکەوە دەبەستێتەوە، کوردیش تەنها وەك (هۆز) دەبینێ، نەك نەتەوە . هەروەها لە بریتی وشەی (فارس) ئەو وشەی (ئێرانی) بۆ فارس بەکاردێنێ ، وەك دەڵێ: "لەم هاوئاییینیەوە ئەتوانین بڵێین کورد و ئێرانی هاوئایین بوون". یاسمی وەك حوزنی موکریانی مێژووی دەقی هورمزگان بۆسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب ناگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەو دەقە بەزۆرداری موسڵمانان لە کوردستان وێنا دەکات، هەروەك لەهەمان لاپەڕە دەڵێ: "هەروەکو لەکاتی هەڵمەت هێنانی ئاتەش خانەی (پاوە)یان وێرانکرد, لە (سلێمانی) پارچە پێستەکیان دۆزیوەتەوە، کەبەپیتی گۆران-هەورامی- نووسرابوو، سکاڵایان لەزۆرداری عەرەبەکان نووسیوە بەڵێ ئەگەر ئەو سکاڵایە هەرلەکاتی هەڵمەتیشدا نەبووبێ، دوای ئەوە بووبێ، ئەو زۆرداری یە لە کوردستان دەرئەخات".

# تێکەڵکردنی ئەنفالی ئیسلامی

# و

# ئەنفالی سەددامی

لێرەدا نامەوێ زۆر لە چەمکی(ئەنفال) بدوێم، بەڵام بەحوکمی ئەوەی بەشێك لەوسورەتەی قورئانی پیرۆز وا لەزەین و زهنیەتی تاکی کورد وێنا کراوە، وەك بڵێی ئەو سورەتە دەرهەق بەکورد دابەزیوە!! بەر لەهەموو شتێ (ئەنفالی قورئان) پەیوەستە بە دەسکەوتی شەڕ ، ئەوەی لەشەڕ و بەرەی شەڕ بۆ لایەنی سەرکەوتوو بەجێدەمێنێ. بەواتای هیچ پەیوەندی بە ڕەوشی دیلەوە نیە، ئەو چەند ئایەتەی سوڕەتی ئەنفال تەواو عەقڵیەتی موئەسەساتی و دادپەوەری دەگەیەنێ، چونکە ئەو دەستکەوتە تەنها کەسی یەکەمی دەوڵەت بۆی هەیە دابەشی بکات، بەپێی ئەو بڕگەیەی دەستوری قورئان. لەلایەکی تر، ئەو ئایەتانە دوور و نزیك پەیوەندیان بە کوردەوە نییە و بەهیچ جۆرێ دەرهەق بەکورد دانەبەزیون، چونکە ئاشنابوونی کورد بە ئیسلام وەك نەتەوە, نەك تاکەکەسی لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی اللە علیە و سلم) نەبووە، بەواتای، کە کورد بە ئیسلام ئاشنا بوو هەموو قورئان دابەزی بوو، ئەو تایبەتیانەش دەرهەق بە (عەرەب)ی بت پەرست دابەزیون، نەك کورد، بەڵام ئەوە بەشێك لە توێی عەلمانی (سیکۆلاریزمی کوردی یە)، مێژوو هەڵدەگەڕێنێتەوە و بە ئارەزووی خۆی ڕووداوەکان تەئویل دەکات. ئەنفالی سەددامیش، ئەنفالێکی قەومی ئایدۆلۆژییە، نەك دینی، چونکە پەیڕەو و پرۆگرامی حیزبی بەعس دوور و نزیك هیچ پەیوەندی بە ئیسلامەوە نیە،

بەڵكو جۆرێكە لەو عەلمانیەتەی توێژی سیكۆلاریزمی كوردی وەك ئەو، بەڵام بەشێوازێكی تر كاری لەسەر دەكات، ئەویش بریتیە لە شێواندنی ئیسلام.

ج.كوردۆ ناوێك لە كتێبی - مێژووی كوردستان ڕەگەز و شارستانیەتی كورد - (١٦٩-١٧٠) لە ژێر سەردێڕی (یەكەم ئەنفالكردنی كوردستان دەقی "هورمزگان") دەهێنێتەوە وەك نمونەیەك لە داگیركردنی كوردستان. ج.كوردۆ لەبارەی زمان و خەت و ئاستی هونەریی ئەو شیعرە ئەوها دەنوسێ: "زمانی هۆنراوەكە - دەقی هورمزگا كوردییەكی ناوەندیە, كە بەیارمەتی دەستنووسی نووسینی ئارامی و ئایدیۆگرامی (هیما/وێنە تیپ) یەوە نوسراوەتەوە - ئەم تێكستە لەسەر پارچەیەك چەرم نووسراوە و لە نزیك (شارەزوور) دۆزراوەتەوە. ئەم هۆنراوەیە لە بەرزیدا بێ وێنەیە و زۆر لە گێڕانەوەی ئەو تراژیدیا گەورەیە دا بەهێزە، كە بەسەر كورد و كوردستاندا هێنراوە، هەروەها ج.كوردۆ دەڵێ: "ئەم تێكستەی لێرەدا بڵاوكراوەتەوە لە - م.ڕۆدینكۆ - وەرگیراوە!"

ئەحمەد شەریف لە تیزی دكتۆراكەیدا (لە ڕۆمانی كوردی دا - كە لەبنەڕەتدا تەنها چەند لاپەڕەیەكی كەمی دكتۆرا نامەكەی پەیوەندی بەو ناونیشانەوە هەیە)!! لە لاپەڕە (١٣-١٤-١٥) دەنووسێ" دەتوانین بیسەلمێنین كە (ئەنفالی یەكەم) لەسەردەمی عومەری كوڕی خەتابی خەلیفەی دووەمی ئیسلام دەستپێكرد و كوردستان بەجارێك وێرانكراو سەروەت و سامانی خەڵك بە تاڵان براو كچ و ژنی كورد بە دیل گیراو ئەسحابەكان بۆ خۆیان دەستیان بەسەر داگرتن، وەكو كچە ئەنفالكراوەكانی گەرمیان لە سەدەی بیستەم"

ئەو پێكچواندنەی ئەنفالی قورئانی و ئەنفالی سەددامی دوورە لە

هەموو دابێکی ئەکادیمی، چونکە توێژینەوەی ئەکادیمی کار لەسەر سەرچاوەی باوەڕپێکراو و بەڵگەنامە دەکات، کەچی کاکی "دکتۆر" یەك بەڵگەش بۆ ئەو قسانەی ناهێنێتەوە! نووسەر ئەو دەقەی هورمزگانی بەباشترین بەڵگە دەزانێ، هەروەها بۆئەوەی بسەلمێنێ ئەو شیعرە گوزارشت لە (ئەنفالی یەکەم) دەکا و (عەرەب) گەلێکی توند و ڕەق و چەتەن، قسەیەکی ئیبن خەلدون دەهێنێتەوە! ئەو قسەیەی ئیبن خەلدون بۆ ڕەوەند و کۆچەری عەرەبە، هەروەها هەمان قسە چەندان نووسەر و توێژەر لەسەر ڕەوند و کۆچەری کوردیان گوتووە!

هەرچەندە ئەو (دکتۆرا نامەیە) وەك هەندێ سەرچاوەی تر ناوی ئەو سەرکردە ناسراوانەی موسڵمانان ناهێنێ، بەلام وەك ئەوان ئاماژە بەهەندی شوێن دەکا، وەك مەزاری پیاوچاکان. مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی لە ولاتگیری عێراقدا تەواوی ئەو قسانە ڕەتدەکاتەوە، دەڵێ زۆربەی کەسانی وەك خالیدی کوڕی وەلید و ئیبن عومەر ...هتد هەر (کوردستان) یشیان نەبینیووە! هەروەها نووسەری کتێبی:(کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا) ئەوە بەبەڵگە ڕەتدەکاتەوە کە ئەو (مەزارانە) هی ئەوکەسانە بن کە ئەو جۆرە سەرچاوانە بانگەشەیان بۆ دەکەن!

ئەو خوێندنەوە و تەئویلکردنی ئەو شیعرە و گریدانی بە کارەساتی جینۆسایدکردنی بەشێك لە خەڵکی کورد!

ئەو جۆرە تێڕوانینە نێگەتیڤە دژ بە بنەماو ئەنگستەکانی ئاسایشی نەتەوەیی و ئایینیی یە! ئەوەندەی ئیسلام شەڕی لەگەڵ دەسەلاتی ئەنزیمەی عەرەبی و عەقڵیەتی ڕەوەندیی و کۆچەریی عەرەبی کردووە، چارەگی ئەوەندە شەڕی کوردی نەکردووە، جاری ئەوسا کورد و کوردستان زیاتر لە هەزار ساڵ بوو دەسەلات و ناسنامەی نەتەوەیی

لەدست دابوو. ویڕای ئەمەش ئەو قسەیەی د. ئەحمەد شەریف " ، کە دەڵێ :هەر لەو سەردەمەدا سەردەمی ئیمامی عومەر، هەرچی پەرستگاو قوتابخانە و پەرتوك و بەڵگەنامەی ئایینی و ئەدەبی ڕۆشنبیری و کەلتوری کوردی هەبوو هەمووی سوتێنران و بە کوفر و ئیلحاد دانران" هیچ بنەمایەکی زانستی نیەو هیچ سەرچاوەیەك پشتڕاستی ناکاتەوە. ئەوسا هەموو کەلتوری کوردی لەناو کەلتوری ساسانی و ڕۆمانیدا شاردرابۆوە، هیچ سەرچاوەیەك نییە باس لە کەلتوری کوردی وەك کەلتورێکی سەربەخۆ بکات، چونکە هەر لەپاش ڕوخانی ئەمپراتۆریەتی میدی، کورد زمان و کەلتور و ئایینی کەوتە ژێر هەڕەشەی داگیرکارانی کوردستان.

کە قورئان بووە ئایینی کورد و ڕەفتار و گوفتاری کورد بەقورئان ستاندەردکرا، ئەوا کورد توانی هەم زمانی نەتەوەیی جارێکی تر لە پەنای شرۆڤەکردنی قورئان لە حوجرە بینا بکاتەوە, هەم توانی وەك نەتەوەیەکیش ناسنامەی نەتەوەیی خۆی هەبێ و نووسەرانی موسڵمانی کورد بە لەقەبی (کوردی)،یان شوێنی جوگرافی کوردستان خۆیان لە (فارس)ەکان جودا بکەنەوە!

## سەلماندنی زەردەشتی بوونی کورد

جارێ پێش ئەوەی لەوخوێندنەوەیەش وردبینەوە، ئاماژەیەك بەڕەوشی ئایینی لە کوردستان بکەین: ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە کە بەشێك لە نووسەری عەلمانی کورد بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە کورد پێش ئیسلام بوونیان هەموو (زەردەشتی) بوونە!

د. ڕەشاد میران لە کتێبی (ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کودستان)

دا، لە لاپەڕە (٤٣) دەنووسێ: "لە کوردستان ڕۆژگاری پێش ئیسلامی دا ڕەوشێکی فرە ئایینی هەبوو و کورد سەر بەتاقە ئایینێکی زاڵەوە نەبوو، بەڵکو لەوێ لەیەك کاتدا، چەند ئایین و پەرستنێکی جۆراوجۆر باویان بووە، وەکو زەردەشتی، مەسیحیەت، جولەکەیی و تەنانەت بتپەرستی و هی تریش"

ئەو فرە ئایینەش بەشێوەیەکی سروشتی نەبووە، بەڵکو هەردەم ئایینی دەسەڵات (زەردەشتی ساسانی نەك زەردەشتی زەردەشت!) هەردەم هەڕەشە بووە لەسەر ئایینەکانی تر! تەنها چەند نمونەیەك لەسەر توندی و ڕەقی زەردەشتیەکان لەسەر مەسیحیە نوێیەکان - کە زۆربەیان لەگەڵ زەردەشتیەکان هاو قەوم بوون - کە چەندەها سەرچاوە باسی لێوە کراوە " لەسەردەمی شاپوری دووەم چەوساندنەیەکی گەورە دەرهەق مەسیحیەکانی (کورد) کراوە کەلەمێژوو دا بە چەوساندنەوەی چل ساڵی ٣٤١-٣٧٩ ناسراوە" لە ساڵی (٣٤٤) کاتێ زەردەشتیەکان بە فەرمانی شاپور (١٢٠) کەسیان لە پیاوی ئایینی و مەسیحی وەك کاهین، شەمەسە، ڕەبەن گرت بۆماوەی شەش مانگ زیندانی کران لە پاشان هەموو بە (شمشێر) سەریان پەڕێندرا!! هەروەها کوشتنی (مارشەمعونی کورد نەك ئاشوری) و (شەهدۆست) و چەندان پیاوی دی مەسیحی، کە ئامادە نەبوون دەستبەرداری مەسیح بن و بگەڕێنەوە سەر (ئاگر پەرستی، یان ڕۆژ پەرستی!) هەروەها ڕەجمکردنی کەسانێکی ناسراوی شاری هەولێر (قەرەداغ) لەساڵی ٣٥٨، بەشێوەی ڕەجمکردنی بەبەرد هەتا مردن!

هەروەها زەردەشتیەکان سەرکردەی ئۆپۆزسیۆنەکان خۆیان ئەوەندە (ناجوامێرانە) کوشتووە، مرۆڤ شەرم دەکا باسی بکات. هەردوو

ئۆپۆزسیۆنی دەسەڵاتی زەردەشتی (مانی) و (مەزدەك) لەناوكۆبوونەوە و كۆنفرانسی دایەلۆگی ئایینی بەدەست سەرانی زەردەشتی غافڵكوژ كراون!!

ئەمە تەنها چەند نمونەیەك بوون لە سیاسەت و هەڵسوكەوتی نامرۆیانەی سەرانی زەردەشتیەت!!

جەلیلی عەباس لە كتێبی ئاڤێستا-گاتاكان لەمێژینەترین سرودی كوردن لاپەڕە (١٠) دوای ئەوەی دەقی هورمزگانی بە "شێوەیەكی تر" دەهێنێتەوە، دەپرسێ: "ئایا هەموو ئەمانە بەڵگە و فاكتەری زیندوو كوردبوونی ئایینە پیرۆزەكە نین؟" نازانم ئەو دەقە كام (وشە و دێڕی) ئاماژە بە كوردبوونی زەردەشت دەكات؟! هەروەها ئەو دەقەی (جەلیل عەباس)ی هێناویەتی لە چەند دێڕێك جودایە لە ئەوانی تر،

هورمزگان ڕمان ئاتران كوژان
وێشان شاردەوە گەورە گاوران

هەروەها هەر تەواو هەڵە لەو دەقە گەیشتووە، هونەری شیعرەكە دەڵێ: ئاهورا بەزەیی بەكەس نەهاتەوە، بەڵام كاك جەلیل عەباسی دەنووسێ .... ئەمەش (ئاهورا) تووڕە دەكات!!! د. ڕەشاد میرانیش لە (ڕەوشی ئایینی ...) لاپەڕە (٤٥) دەنووسێ: "ناوەرۆكی ئەم شیعرانە ئەوە دەردەخا، كە كوردەكان بەلای كەمەوە هی ئەم ناوچەیەی شیعرەكەی تیا نووسراوە (زەردەشتی) بووبن!!

یەكەم دەقی ئەدەبی!

هەرچەندە زۆرێك لە توێژەرانی "زەردەشتیەت" گاتا-كان بە كۆنترین دەقی كوردی دادەنێن، بەڵام نووسەرێكی وەك دكتۆر ئەحمەد میراو دەڵێ:

"تا ئێستا بەپشت بەستن بە سەرچاوەیەکی زۆر، چەند وتارێکم لەسەر زەردەشتاییێتی نووسیوە، هەتاکو ئێستاش سەرچاوەیەکم بەچەنگ نەکەوتووە زمانی ئاویستای بەتایبەتی گاتەکان، کە گومانی تێدا نیە زمانی زەردەشتە، بە زمانی کوردی، یان زاراوەیەکی زمانی کوردی پێناسە کردبێت".

دۆزینەوەی "یەکەم دەق" بەزمانی کوردی، یەکێ لە کێشەکانی مێژووی (زمان) و (ئەدەبی) کورد پێکدەهێنێ. دیاریکردنی "یەکەم دەق" و بەخشینی ناسنامەی نەتەوەیی پێی، پرسێکی ئاسان نییە، چونکە ئەو مەسەلەیە لەم سەردەمەدا بە بنەما و شەنگستی و پرەنسیپی قوتابخانەی جیاوازەوە شرۆڤەکراوە. قوتابخانەی فەرەنسی جەخت لەسەر (زمان)ی دەقەکە دەکات و دەیکاتە مەرج، هەرچی قوتابخانەی ئەمریکی یە ئەوە زیاتر کار لەسەر (ناوەرۆك)ی دەقەکە دەکات نەك زمانەکەی!! دەقی گاتارکان بەو زمانەی سەرەتا پێ ی نووسراوە و بەو ناوەرۆکەی، کە هەیەتی هیچی (ناسنامەی نەتەوەیی کوردبوون - یان تەواو یەکلا نەبۆتەوە!)

لەمەسەلەی دەقی "هورمزگان" دا هیچ ئاماژەیەك بۆ کوردبوونی هونەری شیعرەکە لە ئارادانیە، بەڵکو هونەر تەنیا وەسفی ڕووداوێکی کردووە، کەلە شارەزوور ڕویداوە هەروەك چۆن شاعیرانی وەك (گۆران) و (شێرکۆ بێکەس) شعریان لەسەر هەندێ شاری دەرەوەی کوردستان گوتووە!! جا بەناوهاتنی شاری (مۆسکۆ) گۆران نابێتە (مۆسکۆیی) هەروەها شێرکۆ بێکەس، کە وەسفی جوانی باخچەی (هێرۆ سترۆ)ی بوخارستی ڕۆمانیا دەکاتن نابێتە ڕۆمانی!! لەم ڕوانگەیەوە "شارەزوور"

وەك شوێنێكی ناو دەقەكە، ناسنامەی كورد بوون بە هونەرەكە نابەخشێ هەروەها ئەوسا شارەزوور لە ژێر دەسەڵاتی (ساسانی) دابووە، نەك دەسەڵاتی كورد!دەربارەی زمانی دەقەكەش – كە پاشان لە شرۆڤەكردنی دەقەكە كاری لەسەر دەكەین – وەك زمانی ئاوێستا یەكلا نەبۆتەوە كەتەنها زمانی كوردی بووبێ؟! چونكە دەقەكە خۆی بە پەهلەوی نووسراوە!! هەرچۆنێ بێ، دەقەكە و زمانەكەی هۆكارێك بووە بۆ ئەوەی هەندێ نووسەری كورد وەك عەلائەدینی سەجادی و زوبێر بیلال و محمد ئەمین هەورامانی ... هتد ئاماژە بەدەقی (هورمزگان) بكەن!

عەلائەدینی سەجادی لە كتێبی (مێژووی ئەدەبی كوردی، چاپی یەكەم ١٩٥٢، لاپەڕە (١٢٩–١٣٠) دەنووسێ: جا لەبەر ئەمە ئەو شیعرانە (دەقی هورمزگان) وەكو چۆن بەڵگەیەكە بۆ زمان و ئەدەبەكەی كوردی هەروەها ڕوشتەیەكیشە بۆ ئایینی لەوە پێشیان. سەجادی چەند (گومانێك) لەسەر دەقەكەی دادەنێ – لەپاشان لە ژێر سەردێڕی هەبوون و نەبوونی چەرمەكە – قسەی لەسەر دەكەین – دووبارە دەڵێ مەبەستی ئەو لە هێنانەوەی ئەو دەقە ئەوەیە: "قسەكە هەر ئەوەندەی ئەگەر ئەم پارچە چەرمە بووبێت هۆنراو و زمانێكی زیاتر لە هەزار و دووسەد ساڵی بە ئێمە پیشان ئەدا ..." مامۆستا زوبێر بیلال یش لە (مێژووی زمانی كوردی) لاپەڕە (٧٨) دەنووسێ: "ئەو پارچە پێستە بە زمانی كوردی شێوەی (گۆرانی) هەورامانی نووسراوە" هەروەها (سەجادی) و (زوبێر بیلال) هۆنینەوەی ئەو دەقە و مەیل مان بەلای زەردەشتیەتدا دەڵێت: "ئاساییە گوزارشت لە سروشتی مرۆڤەكان دەكات، ئەمەش یاسایەكی سروشتییە هەر قەومێك چووە شوێنێك و ئەو شوێنەی گرت، دانیشتوانی شوێنەكە

هەتا یەك دوو نەوە لەوانەیە عەنعەناتی پێشووی خۆیان هەر لەبیر ناچێتەوە... سەجادی لاپەڕە (١٣٠)"

"لەسەدەی حەوتەمی زایینی دا (٢٢)ی کۆچی ئەم کوردانە، بەتەواوی موسڵمان بوون، بەڵام لەگەڵ ئەم ئایین گۆڕینەش دا، مەیلی دانیشتوان و خەڵکی، بەلای ئایینی زەردەشتی دا هەر مابوو، زوبێر بیلال لاپەڕە (٧٨)"

محمد ئەمین هەورامانی لە "مێژووی ڕێزمانی زمانی کوردی" لاپەڕە (٢١٥-٢١٦) زمانی دەقی "هورمزگانی" بەشێوەی (ماچۆ) داناوە، هەروەها زمانەکەی بە زمانی سەرەتای پەیدابوونی ئیسلام لە کوردستان داناوە، هەروەك لە لاپەڕە (٢١٦) دەنووسێ: لە ڕووی ساکاری وشەکان و ڕووڵەتی کۆنیان و نەبوونی وشە، عارەبی و بێگانە، تیایدا و هەروەها لە ڕووی کێش و (سەرواوە) لەوە دڵنیامان دەکات، کە ملە جێڕی لەوە نەکەین، کە زمانەکەیان زمانی سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامی پیرۆزە.

سەدیق بۆرەکەیی لە لاپەڕە (٢١) کتێبە دەستنووسەکەی دا دەنووسێ: "کۆنترین هۆنراوەیەك ، کە بە زاراوەی گۆرانی بەیادگار ماوەتەوە هۆنراوەی هورمزگانە، کە هونەرێکی هورمزگانی هۆنیویەتیەوە" هەروەها "بۆرەکەیی وەك حوسێن حوزنی موکریانی، ئەو پارچە هەڵبەستە بە نمونەی بایی ترین (پڕ بەها) ترین هۆنراوەی کوردی، کە بەیادگار ماوەتەوە"!! دادەنێ!

# دەقی هورمزگانی
# دەقێکی ساختەیە؟!

زۆرجار دەقێک، مێژوویێک دروست دەکات، یان هەوڵ دەدرێ بە بەهانەی دەقێکەوە، مێژوویێک لەسەر مێژوویێک دروست بکرێ، جا وەک چۆن حکومەتی سێبەری هەیە، ئەوە، بەڕای من، مێژووی سێبەریش هەیە تەئویل بۆ ڕوداوێکی مێژویی بکات، یان لە ناو وەهم و زەینی تاکەکانی کۆمەڵگادا ڕوداوێک دروست دەکات، بەو دیماکۆژیەتیوە بکاتە ڕوداوێکی ناو مێژوو! دەقی هورمزگانی، یەکێ لەو دەقانەیە، کە عەلمانیەتی-سیکیولاریزمی کوردی لێرەو لەوێ دەیوروژێنێ و دەیەوێ لەو میانەوە چەواشەی مێژوو بکات، یان هیچ نەبێ "گومان" لەلای تاکی بێ ئاگاو نا هۆشیاری کورد دروست بکات، ئەو سیاسەتە کوردی نییە، زادەی تێفکرین و خوێندنەوەی ڕۆناکبیری کورد نییە، سیکیولاریزمی عەرەبی زۆر هەوڵی بۆ دا لەبەر ڕۆشنایی قسە بێ بنەماکانی ڕۆژهەڵاتناسان، چەندەها ژێدەرو سەرچاوە بۆ قورئان دابڕێژرێ، یەکێ لەو ئەفسانانەی سیکیولاریزمی عەرەبی، وروژاندنی شعیری جاهیلییە. هەر بۆ ئەوەی گومان لە (زەمین) و (سادەیی) تاکی عەرەبی دوور لە ژیار و شارستانی ئەمڕۆ دروست بکەن وتیان: (محمد) بەشێک لەئایەتەکانی قورئانی لەسەر شێوازی شیعری جاهیلی دارشتووە! بەڵام کاتێک لە ژیاننامەی ئەو شاعیرانە ورد دەبینەوە، بۆمان دەردەکەوێ ئەوانە ، یان لەسەردەمی پێغەمبەر ژیاون، یان لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسی! یان جاهیلی ئەوانە

پەیوەست نەبووە بە"ڕۆژگار"ەوە بەڵکو زیاتر بە "هزر"ەوە!! هەر بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو چەواشەکردنەوە، ئەو دەقەی (ڕوتبەی کوڕی عەجاج) دەهێنمەوە:

ومسلم مامس اصحاب الفيل

ترميهم حجار من سجيل

ولعبت كير بهم ابابيل

فصيروا مپل كعصف ماكول

نوسەرێکی کورد، ئەوشاعیرە بە شاعیری سەردەمی جاهیلی دادەنێ و دەڵێ : دوای چەند ساڵێك لە وتنی ئەم شیعرە، قورئان هاتووە سوڕەتی (فیل)ی داڕشتۆتەوە. ئەوەی لەمێژوو شارەزانەبێ ئەو(گومانە)ی عەلمانیەتی- سیکیولاریزمی عەرەبی و کوردی لەلا دەبێتە "یەقین"، بەڵام ئەوەی لە قورئان بگاو ئاگای لەمێژووبێ, دەزانێ ئەوە ئەو جۆرە ئەفسانەیە تەنیا لەخانەی بۆشی ئەوان جێ ی دەبێتەوە!! روتبەی شاعێر نەك هی سەردەمی جاهیلی نییە، بەڵکو(روتبە) هی سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەکانی ڕاشیدیش نییە، بەڵکو زیاتر لە هەشتا ساڵ دوای دوا خەلیفەی ڕاشیدی مردووە !!! لێرەوە، کێ دەڵێ ئەو شعرەی هورمزگان وەك ئەوەی ڕوتبەی کوڕی عەجاج هی سەردەمێکی نوێ نییە؟! ئەم مەسەلەیە لەچەند خاڵێك تاوتوێ دەکەین:

## یەکەم: شێوازی دۆزینەوەکەی دەقەکە،

جیاوازی گێڕانەوەی چیرۆکی دۆزینەوەکەی، گومان لەلای خوێنەر دروست دەکات. حوسێن حوزنی، دەروێشێکی نوشتەچی، فاڵچی دەکاتە

ژێدەری دۆزینەوەی دەقەکە، ئەم "ڕا"یەش پێوەرێکی زانستی نییە و شایەنی قەبوڵکردن نییە، چونکە حوزنی پێمان ناڵێ ئەم دەروێشە ئەو دەقەی لە(کوێ) و (کەی) دۆزیوەتەوە؟! جا بۆ ئەوەی چارەنووسی (دەقە)کەش لێڵ بکات، ئینگلیزێك لەو دەروێشەی کڕیوە، بەڵام کەس نازانێ ئەو ئینگلیزە کێ بووە و ئەو ڕوداوەی کڕینی دەقەکە لەچ سەردەمێك بووە؟! بەڵام ئەوەی ئاگای لە مێژووبێ دەزانێ ئینگلیز لە بیستەکانی سەدەی بیستەم هاتۆتە سلێمانی، نەك ساڵی نۆزدەی کۆچی!! عەلائەدین سەجادیش، کە لە دەقە فارسیەکەی کتێبەکەی ڕەشید یاسەمی ئەو دەقەی گواستۆتەوە، لەلاپەڕە(١٣٠)ی چاپی یەکەمی مێژووی ئەدەبی کوردی، دەنووسێ: ئەم شعرانە دەقی هورمزگانی، کە من لێرەدا باسی ئەکەم و هێناومە بۆ بەڵگەی شیعرو ئەدەب و زمانی کوردی لە دەوری دووهەمی ئەدەبی کوردیدا ناتوانم بچمە ژێری و بڵێم بونەکەی ڕاستە, یان ڕاست نییە، چونکە نەخۆم ئەوپارچەم چەرمەم دیوە, کە ئەم شیعرانەی لێ نووسراوەتەوە, نە لەقسەی ڕۆژهەڵاتی ناسێکدا بەرچاوم کەوتوە، بەڵکو تەنیا قسەیەکە مامۆستا ڕەشید یاسەمی لە لاپەڕە(١٢٩)ی کتێبەکەیدا (کورد) باس ئەکا، ئەویش بەبێ بیکەیەنێتەوە بە ئەوەی کەسێك، یان بەسەر چاوەیەك!!

حوسێن حوزنی موکوریانی و سەدیق بۆرەکەیی، د.جەمال نەبەز، د.سەعیدی خانی کوردستانی بە ژێدەری ئەو دەقە دادەنێن. دەقی هورمزگانی، دەقێکی ڕەخنەییە لە ڕەفتاری موسڵمانەکان لە بەرامبەر زەردەشتیەکان ، هەروەها ئامۆژگارێکی هەڵەشی تێدایە دەربارەی سوڕەتی ئەنفالی قورئان, هەروەها هەر ئەو دەقە وای لە کەسانی وەك

(ج.کوردۆ) و (ئەحمد شەریف) و هی تری کردووە لەمیانەی ئەو شیعرە ڕەخنە لە موسڵمانان و قورئان بگرن! د.سەعید ی کوردستانی، کۆنە مەلای سنە، ئەو دەقەی بەو بیانووە و بەهانەوە بڵاو کردۆتەوە د.سعید ڕاست گۆنەبووە، بەرانبەر ژێدەری ئەودەقە، چونکە بێهزاد لەکتێبە کەی – وەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا – لەشێخ عەلائەدینی وەرگرتووە و بەهیچ جۆرێ ناوی شێخ عەلائەدین ناهێنێ !! لە کتێبی "پزیشکێك لە کوردستانەوە" نووسینی (جای. م. ڕەسولی و کادی هـ. ئیلین) باس لە د.سەعید وەك (مەسیحیەکی پاك !) دەکەن، بەڵام هەرئەوەندە دەربارەی شێخ عەلائەدین بڵاودەکەنەوە. کەگوایە ناوی عەلائەدین بەگ بووە. هەروەها لەلاپەرە(١٠٩) دەربارەی عەلائەدین دەڵێن: عەلائەدین بەگ کابرایەکی زانابوو، خەت و نووسینێکی جوان و نایابی هەبوو، بەهۆی برینێکەوە، کە لەناو دەماغ ومێشکیدا دروست بوو بوو، تووشی نەخۆشی لەبیرچوونەوە بوو بوو" ئەو نەخۆشیەی عەلائەدین (لەبیرچوونەوە) دەرفەتێك بووە بۆ ئەوەی ئەو نووسینانەی ئەو، د.سەعید لێ وەرگرتوون و بە ناوی خۆی و بە ئارەزووی خۆی بڵاو یان بکاتەوە! یاسین صابر صالح لە ئینسیکلۆ پیدیای گشتی، سلێمانی ٢٠٠٥، لاپەرە (٥٦٨) دەنووسێ د.سەعید کوردستانی ژیانی بە پزیشکی و هۆنینەوەی شیعری بردۆتە سەر، هەرچەندە بۆتە مەسیحی، بەڵام (هەستی کوردایەتی) لە جاران زیاتر بووە .... چەند نامیلکەیەکی زانستی و ئایینی بە شیعر داناوە، لەوانە (نزانی،مزگانی) بەکوردی و نامیلکەی (ئاو) بەفارسی" جارێ لەقەبی (کوردستان) هیچ پەیوەندی بە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، یان کوردستانی گەورەوە نییە، بەڵکو(کوردستانی) تەنها پارێزگای

(سـنه)دەگرێتـەوە! د.سـەعید، ژیـانی هـەموو وەك مـسیۆنێرێك(ئـەو قەشەیەی خەڵك دەهێنێتە سەر دینی مەسیحیەت) بردۆتە سەر، هەروەها وەك مۆزەی سوپای ئەمەریکی دەنووسێ: د.سەعیدی نوێ، مەلاسەعیدی کۆنی سنە ئینجیل ی بۆ (مسیۆنی ئامریکایی) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، هەروەها نوسەرانی کتێبی " پزیشکیك لە کوردستانەوە تەوا و جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە، کە د.سەعید هەرخەریکی بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت بووە، هەروەها خەریکی (گومان) دروست کردن بووە لەسەر ئیسلام. ئەوەتە لەگفتوگۆیەك لە گەڵ ئامۆزایەکی خۆی لە لاپەڕە(١٢٤) وەك مەسـیحیەك گومـان لـە ڕزگـاربوونsalvation لەئیـسلام لـەلای ئامۆزاکەی دروست دەکاو دینەکەی خۆی واپیشاندەدا، کەڕزگاربوونی تێدا مسۆگەرە: د.سەعید: ئامۆزا ئێستا عومرت نزیکەی شەست ساڵێك ئەبێت، سەری مەککەو مەدینەت داوە و حەجت کردووە، دوای ئەم هەموو شتانە، باوەڕت بەوە هەیە، کە تۆ وەرگیراوی و قبوڵ کراوی لە لای خواوە؟ بابڵێین ئەوشەو تۆ دەمریت، لێت ڕوونە دەچیتە بەهەشتەوە؟

مەلا: نا، بەڵام کێ ئەوەی لا دیارەو لای ڕوونە؟ دوکتۆر: حاجی، ئەو دینەی زامن نیە بۆ ڕزگار کردنم بە فلسێ ناکرم...!! بەڵێ، کە دکتۆر سەعید، ئیسلام بە قەولی خۆی بەفلسێ نەکڕێ، جا چاوەڕێ ناکرێ دەقێکی وەك دەقی هورمزگانی نەنووسێتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی وەك براکەی و ژنەکەی لە ئیسلام هەڵگەڕێنێتەوە، وێڕای ئەمەش، د.سەعید هەردوو کوڕەکەی بە ناوی (لۆیل)و (سامۆیل) ناو دەنێ !!! ئەمە چ کوردایەتی " یەکە !!

لەمانەش زیاتر بێهزاد خۆشحاڵی لە کتێبی فیلۆ لۆجیای زمانی

کوردی و مێژووی کوردستان" چەند گومانێك لە سەر "دەسپاکی" و" تیۆری دۆزینەوەی بەڵگەنامەکانی بەزمانی هەورامی دەخاتە ڕوو. لەلاپەڕە (١٤٨) کتێبەکەیدا، بێهزاد دەنووسێ: لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کە دکتۆر سەعید لەگەڵ زۆربەی توێژەرانی دونیای (دێرین ناسی)و (مێژوو) ئاڵوگۆڕی نامەی هەبووە، لەوانە "تیۆدۆر نۆڵدەکە"ی ئەڵمانی و(ئەدواردبراون) کەچی باسی شوێن و سەرچاوەی ئەو(تیۆرییەی) خۆی نەکردووە، هەروەها هەر لە هەمان لاپەڕەدا دەنووسێ: دکتۆرسەعید لە نووسینەکانیدا هەرگیز باسی ئەوەی نەکردووە،ئەم(کەونە نووسراوانەی) لەکێ وەرگرتووە، هەرگیز ناوی شێخ عەلائەدین نەقشبەندی نەهێناوە، نیشانەکان وادەگەینن کەتەوەری سەرەکی وەدەست هێنانی ئەو کەونە نووسراوانە، شێخ عەلائەدین بووە.

## دووەم: گومانکردن لە ئەسڵی دەقەکە

زۆربەی ئەو نووسەرانەی باسی ئەو دەقەیان کردووە، خۆشیان گومانیان لە ڕاست و دروستی دەقەکە هەبووە، جگە لە د. سەعیدی کوردستانی(سنەیی)، حوزنی موکریانی و ڕەشید یاسەمی و هەورامانی ....، ئەوانی تر وەك عەلائەدین سەجادی، د.ڕەشاد میران، د.جەمال نەبەز، د. عزەدین مستەفا ڕەسوڵ باوەڕیان وابووە، کە ئەو دەقە گومان هەڵگرە، چونکە نە مەرجە زانستی و ئەکادیمیەکانی تێدایە، نە هیچ کۆنیار ناسێك "کۆنێتی"-کەونێتی ئەو دەقەی ساغ کردۆتەوە. وێڕای ئەمەش لە هیچ مۆزەیەکی-مۆزەخانەیەکی ڕۆژئاوا بوونی نییە. ئەو ئینگلیزەی گوایە لە سلێمانی لە دەروێشێ، یان کرێکارەکانی کڕیوە، نەیتوانیووە

ڕۆژئاوایەکانی پێ هەڵخەڵەتێنێ! سەجادی لەلاپەڕە (١٣٠) دەنووسێ: "ناتوانم بچمە ژێر ئەو شعرە و بڵێم ڕاستە،یان ڕاست نیە" هەروەها لەهەمان لاپەڕە گومانەکەی زیاتر دەکاو دەنووسێ: "نە خۆم بینیوومە، نە لە قسەی ڕۆژهەڵاتناسێك گوێم لێبووە! هەروەها ڕەشید یاسەمی, نە کەسەکە دیاری دەکا, نە سەرچاوەکەشی! د.ڕەشاد میران لە لاپەڕە (٤٥) باسی ئەو شیعرە دەکات، بەڵام لە پەراوێزی (٢٣) لاپەڕە (٢٢٨) دەنووسێ: "بەڵام ڕایەکی واش باوە، کە گومان دەخاتە سەر ڕاستی ئەم شیعرە و گوایە ئەمە بەم دواییە هەڵبەستراوە" د. ئەحمەد شەریف لەلاپەڕە (١٤)ی "دکتۆرا نامەکەی" دەقەکە بە یەکەم ئەنفالی کوردستان دادەنێ، بەڵام لە لاپەڕە (١٥) دەنووسێ: "هەرچەندە ئەم شیعرە، تائێستا جێگای گومانە لەلایەن هەندێ ڕۆشنبیرەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ عەقڵ و لۆجیك دەگونجێ، بۆیە بە نمونە هێناومەتەوە"!

د. عزەدین مستەفا ڕەسول لەلاپەڕە (٥٦)ی "الواقعیه فی الادب الکردی" دەنووسێ: "ویروی (رشید یاسمی، ابیاتا شعریاً یقول بأنها وجدت علی قکعه جلد فی کهف (هزار میرد) قرب السلیمانیه ولایزکر الکاتب شیئاً عن مکان القکعه الجلدیه مایلقی الشك ایچا علی هژه الابیات. وتروی الانسکلوبییدیا السوفتیه الکبری، وتقول بان القکعه وجدت فی السلیمانیه علی ورق قدیم بالحروف الارامیه، بینما یقول یاسمی بانها بالخگ البهلوی القدیم واغلب الڤن ان الانسکلوبییدیا المژکوره قد اعتمدت علی المصادر الفارسیه التی یمکن الشك فی وجود غرچ سیاسی لها بالاتیان بهژه الروایه." د.جەمال نەبەز لەلاپەڕە (١١١)ی کتێبی "زمانی یەکگرتووی کوردی" دەنووسێ: "ئەمە (٥٠) ساڵ پترە گەلێ سەرچاوەی

کوردی و بێگانـە دا هـەواڵێك بڵاودەکرێتـەوە بـەو بۆنەیـەوە، کـە گوایـە دەروێشێك لـە دەشتی شـارەزوور پارچـە پێستێکی دۆزیوەتـەوە، کـە بـە ڕێنووسـی پەهلـەوی، چوار دێڕ هـۆنراوەی کـوردی لەسـەر نوسـراوە، کـە هونەرەکەی گوایە ئاخ و داخی هەڵکێشاوە بۆ ئایینی زەردەشتی، کە چۆن لەلایەن هێرش بەرانی عـەرەبی موسڵمانەوە لـەنێوبراوە و سـکاڵا لەدەسـت ئـەو هێـرش بەرانـە دەکـا، کەچـۆن ژن و کـچی بـەدیل گرتـووە و خـوێنی خەڵکیان ڕشتووە. ئەوەی ڕاستی بێ، ئەم هۆنراوەیە هۆنراوەیەکی ساختە و دەستکردە و بەپێ ی زانستی زمانـەوانی، دەتـوانین پیشانی بـدەین، کـە کوردی یەکەی ناتوانێ ببێتـە کـوردی دەرووبـەری پەیـدابوونی ئیسلام."

هـەروەها د. جـەمال نەبـەز لـە وەڵامـی نامەیـەك بـۆ سـەدیق بۆرەکـەیی دەنوسـێ: "هـۆنراوەی مزگـان یەکـەم کـەس کەباسـی لێـوە کـردووە، د. سـەعید خـانی کوردسـتانی یـە، ئـەوجا ڕەشـید یاسـەمی لـەوەوە وەری گرتـووە و لەوێـشەوە ئـەوانی دیکـە. پێـستە ئاسـکێك کـە ئـەم هـۆنراوەی لەسەر نووسرابی لەهیچ مۆزەخانەیـەك دا بەرچاو نەکەوتووە. خۆم چەند چووم بۆ لەندەن و لە مۆزەکان گەڕاوم هیچی وام نەدیوە."

## سێیەم: لەبەر ساختەبوونی دەقەکە، گـەورە مێژوونووسـانی کـورد باسی ئەو دەقەیان نەکردووە

شەرەفخانی بەدلیسی و محمد ئـەمین زەکـی، صـالح قـەفتان، مـەلا جـەمیلی ڕۆژبەیانی باسیان لەسەردەمی موسڵمان بوونی کورد کردووە و ئاماژەیان بـــە هەنـــدێ شـــەڕیش داوە. دەربـــارەی شـــەڕی شـــارەزوور، کتێبـــە ئیسلامیەکانیش وەك تەبەری و ئیبن کەسیر و، ئیبن خەلدون باسیان لەو

قۆناغە کردووە. هەندێ وەك بەلازری و ئیبن خەلدون دەنووسن،کە خەڵکی شارەزوور بە باجدان تەسلیم بوون: ئیبن خەلدون لە کتێبی (العبر،ج٢،ل١١٩) دەنووسێ: عوتبەی کوڕی فەرقەدی ئەلسەلەمی کاتێ (شارەزوور) و (سامفای) فەتح کرد، خەرج و باجی بەسەر دانیشتوانەکەی سەپاند" هەروەها بەلازریش دەنووسێ: کە عوتبەی کوڕی فەرقەد سامفان و دارابادی لە ڕێگای ڕێکەوتنەوە فەتح کردووە، جگە لە سەپاندنی خەرج و باج ئەو دوو مەرجی تری بۆ خەڵکەکە داناوە, کە پەلاماری فاتحین نەدەن و ڕێگەیان نەگرن، کەچی لە "الكامل في التاريخ" هاتووە کە شەڕێکی قورس لە شارەزوور ڕووی داوە، محمد ئەمین زەکی لە خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، لاپەڕە (٢٩٢) باسی ئەو شەڕە دەکات" کەچی هیچ یەکێ لەو مێژوونووسە عەرەب و کوردانە باس لەو پارچە پێستە ناکەن!! لەناو ڕۆژهەڵاتناسەکانیش، ئارشاك پۆلادیانی ڕۆژهەڵاتناس لەکتێبێکیدا بەکورتی باسی ڕەوشی کورد لەسەدەی حەوتەم هەتا دەیەم دەکات، کتێبەکە ئەوەندە "ڕۆژئاواییانە" نووسراوە بەجۆرێ کوردە سیکیۆلاریزمەکانی باشور بەسێ ناونیشانی جودا وەریانگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی: "کورد لەسەرچاوە عەرەبییەکان دا"، "کورد لەسەدەی حەوتەمەوە تا سەدەی دەیەم"، کەچی پۆلادیان بەهیچ جۆرێ بە ئاماژەش باسی ئەو پارچە پێستە ناکات! ئەگەر ئەو دەقە لە مۆزەکانی ڕۆژئاوا هەبوایە، دەبوو لەو کتێبەی پۆلادیان هەبوایە، چونکە "ڕووداوی شارەزوور" بەشێك لە کتێبەکە پێکدێنێ"

ڕۆژهەڵاتناسێکی وەك باسیلی نیکیتین، کە زۆر سوودی لەمەلا سەعیدی قازی بینیووە، د. نەجاتی عبداللە دەربارەی ڕۆڵی ئەو مەلا

کوردە لە لاپەڕە (١٥)ی کتێبی "بازیل نیکیتین کوردناسی "دەنووسێ:
"کارە کوردناسیەکانی نیکیتین بەشی زۆریان بەرهەمی قەڵەم و زادەی ئەم
مەلاو ڕوناکبیرە کوردە ناو ونبووەن" کەچی نە مەلا سەعید (١٨٨٥-
١٩١٨) وە نە بازیل نیکیتین (١٨٨٥-١٩٦٠) باسی ئەو شیعرە ناکەن!!

چاوەڕێ دەکرا، شوکر مستەفا لە کتێبی سەرچاوەکانی بیر و باوەڕی
کوردەواری" باسی ئەو شیعرەی بکردبایە، چونکە، ئەو، بەقسەی خۆی،
هەرچی بەشێك بووە لە فۆرمەلەکردنی بیر و باوەڕی کوردەواری قسەی
لەسەر کردووە!!

د. کوردستان موکریانی، کە خۆی گۆڤاری زاری کرمانجی ئامادە
کردووە و چاپکردۆتەوە، بەڵام لە کتێبی "سەردەمانی زمانی کوردی"
باسی ڕەوشی زمانی کوردی لە چەندەها قۆناغ کردووە و ئاماژەی بە
هەندێ بەڵگەی هەورامان داوە، هەروەها باسی لە ڕەوشی کورد
لەسەردەمی ئیسلامیدا کردووە، بەڵام بە ئاماژەیەکیش باسی شیعری
هورمزگانی نەکردووە!! جا ئەگەر دەقی هورمزگانی، دەقێکی پڕ بەهابێ
بۆ زمان و مێژووی کوردی هەروەك حوزنی موکریانی مامی د.کوردستان
بانگەشەی بۆ دەکات، بۆچی برازاکەی وەك دەقێکی کوردی و نووسراو
بەزمانی کوردی باسی لێوە نەکردووە؟!

هەروەها، د.مارف خەزنەدار لە "مێژووی ئەدەبی کوردی دا" بە
درێژی باسی سەردەمی موسڵمانبوونی کوردی کردووە و باسی هەندێ
دەقی "کوردی" لەسەردەمانێك کردووە، بەڵام هەتا ئاماژەیەکی
ناڕاستەوخۆشی بۆ هەبوونی دەقی هورمزگان نەکردووە، دەربارەی
سەرەتاکانی ئەدەبی کوردی بەرگی یەکەم لاپەڕە (١٥٦-١٦٠) شیعری

ئاینی و لیریکی (غنائی) لە دیالێکتی گۆرانی کۆنترین شعری زمانی کوردیە، لەسەدەکانی ناوەڕاست پەیدا بووە" دوو بەیتەکانی بابەتاهیر بەسەرەتای شیعری کوردی دادەنرێت". نووسەرێکی دی کورد، ئەمین نەقشبەندی لە وتارێکی درێژ بەناوی "شارەزوور و شارەزووریەکان" لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، بەرگی دەهەم، (١٩٨٣) لاپەڕە (٤٢-٧٥) هەتا باسی کتێبەکەی "ڕەشید یاسەمی"یش دەکات، هەروەها باسی موسڵمانبوونی خەڵکی "شارەزوور"یش دەکات ، بەڵام هەتا ئاماژەیەکی ناڕاستەخۆش بۆ دەقی هورمزگانی ناو کتێبەکەی یاسەمی ناکات. ئەمانە هەموو بەڵگەن، کە زۆربەی نووسەرە جدییەکان باوەڕیان بەو دەقە نەبووە!

زۆربەی نووسەرانی باشور و بەشێ لە ڕۆژهەڵات ، بەهەڵە شرۆڤەی بەشێکی ئەو دەقەیانکردووە، ئەوە لەپاشان دەستنشیانی هەڵەکان دەکەین، بەڵام زۆربەیان بانگەشەی ئەوە دەکەن ، کە ئەو دەقە بە زمانی (پەهلەوی)، هەندێ دەڵێن (خەتی پەهلەوی) و هەندێکی تر دەڵێن خەتی (ئارامی) نووسراوە!! ئەم جیاوازیە لەوەدا دروست بووە کە هیچ کەسێك لەو نووسەرانە ئەو دەقەیان نەبینیوە، کە بەو (زمان) و (خەت) و (ڕێنووس)ە کۆنەوە نوسراوە، ئەمە بیرکردنەوە و ڕای دوور لە ئەکادیمیەتە.دۆگمای ئایدیۆلۆژی و ڕق لە ئیسلام وایلێکردوون، هەتا باوەڕ بە ئەفسانەش بکەن و ئەفسانەی پێستەکە دروست بکەن, ئەگەرنا ئەگەر تەنها ساتێك دەستەمۆی لۆژیك و ئەکادیمییەت بن دەرك بەوە دەکەن ئەو دەقە کۆن نییە !!

د. سەعیدی کوردستانی لە کتێبی "نزانی، مزگانی" دەڵێ: "ئەو

پارچە هەڵبەستە (بەخەتی پەهلەوی) نوسراوە" سەدیق بۆرەکەیی دەنووسێ: "ئەم هۆنراوە و یەکێکی تر بەهەمان ناوەرۆك (بەزمانی پەهلەوی) نووسراون" زوبێر بیلال لە لاپەڕە (٧٨) دەنووسێ: "ئەو پارچە پێستە بەشێوەی (گۆرانی) هەورامانی و بە نووسینی (پەهلەوی) نووسراوەتەوە. ئەو خەتەش (ئەلف و بێ ی ئارامی)یەوە وەرگیراوە."

د. ڕەشاد میرانیش لە "ڕەوشی ئایینی..." لاپەڕە (٤٥) دەنووسێ: "ئەم شیعرانە بە (دیالێکتی گۆرانی) نووسراون" د. جەمال نەبەز لە لاپەڕە (١١١)ی زمانی یەکگرتوی کوردی دەنووسێ: "گوایە! هۆنراوەکە بە"ڕێنوسی پەهلەوی" نوسراوە".

# زمانی پەهلەوی

زمانی پەهلەوی، زمانێکی کۆنی "ئێرانی" بووە. بە زمانێکی هیند و ئێرانی دادەنرێ, لێرەوە ناسنامەی "فارس" و "کوردی" ئەو زمانە تێکەڵ دەبێ، چونکە مێژووی (ئێران) لەدوای ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی (میدی) یەوە، خوێندنەوەیەکی "نەتەوەیی" بۆ کراوە و وشەی "ئێران" بە (فارس و وڵاتی فارس" شرۆڤەکراوە، بەڵام لەبنەڕەتدا وشەکە ئەو واتا تەسکە نابەخشێ!

زمانی پەهلەوی, زمانی پاڵەوانەکان، زمانی ڕەسمی ساسانیەکان بووە, هەروەها دەوترێ کە لەسەدەی سێ هەمەوە, هەتا سەدەی هەشتەم نوسین و قسەی پێکراوە، لە ئێران – وڵاتی ئاریان، بەڵام ئەو زمانە ڕێنوسێکی script زۆر دژوار و زەحمەتی هەبووە، بۆیە هەر لەسەردەمانێکی ساسانیەکانەوە نووسینی (کەم)ی پێ کراوە، هەر زیاتر زمانی ئاخاوتن بووە.

## پەهلەوی کوردی یان فارسی بووە؟

د. جەمال نەبەز لە لاپەڕە (٩٢)ی کتێبی "بێدەسەڵاتە کوردەکان و برا موسڵمانەکانیان" دەنووسێ: "ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپیەکان زمانی پەهلەوی pehlevi بە زمانی فارسی ناوەڕاست ناوزەد دەکەن". بەڵام د. نەبەز خۆی زمانی پەهلەوی بە "زمانێکی سەربەخۆ" دادەنێ، بەوەی نزیکترە لە زمانی کوردی وەك لە فارسی. ئەو ڕایەی د.نەبەز لە سەر بنەما و شەنگست نییە، تەنیا نزیکی وشەکانی زمانەکە و شوێنەکەی کردۆتە

مەرج! سەدیق بۆرەکەیی لەبەرگی یەکەمی مێژووی ویێژەی کوردی لاپەڕە (٢٤-٢٥) دەڵێ: زمانی پەهلەوی لە زمانی کوردی دەچێ و نزیکترین زاراوەی (زار)ی کوردی،کە لەگەڵ ئەم زمانەدا هاوچەشنە, زاراوەی گۆرانی و و لوڕیە." بۆرەکەیی و زوبێر بیلال هەندێ "بەڵگە" دەهێننەوە بەوەی, کە زمانی پەهلەوی زمانی کوردییە, یان زارێکی کوردی یە. گیو موکریانی بانگەشەی ئەوە دەکات, کە کتێبی (دین کەرد) بە زمانی پەهلەوی نووسراوە، ئەو زمانەش زمانی لوڕ و کەلهوڕ و شوانانە. مەردۆخی مێژوو نووسی کوردیش دەڵێ: "زمانی پەهلەوی یەکێ لە (شێوەکانی کوردی) بووە, کە گەڵێ بە زاراوەی لوڕی و گۆڕانیەوە نزیکە".

زوبێر بیلال دەڵێ:" دوو جۆر پەهلەوی هەیە، پەهلەوی سەردەمی ئەشکانی ٣٠٠٠پ.ز ٢٢٤ز ئەو شێوەیان لە (هەورامی) و (فەیلی) دەکات، پەهلەوی ساسانی ٢٢٤-٦٣٠."

لەلایەکی تر، (ئاربرکە) لە ئەتڵەسی زمانەکانی هیندۆ – ئێرانیدا، کوردی و فارس بە دوو زمانی (ئێرانی) دادەنێ، بەڵام لەژێر فارسی کۆن، زمانی پەهلەوی و وەك بەشێك لە قۆناغی, یان قوناغێك لە زمانی فارس دا دەنێ، د.فرست مرعی لە "کردستان في القرن السابع المیلادي" لاپەڕە (٢٤) دەنووسێ, کە لەسەرچاوە عەرەبیە موسڵمانەکانیش زمانی (فارسی) و (پەهلەوی) لەیەك جیاکراونەتەوە, بەتایبەتی لەسەردەمی ئیسلامیدا.

بەکورتی، پەهلەوی زمانێکی ڕێنووس ئاڵۆز و گران بووە، بۆیە لەسەردەمی ئەخمینیەکان لەلایەك و سەردەمی ئەشکانی و ساسانیەکان، ماوە ماوە تەنها وەك (زمانێکی) ئایینی، یان ئاخاوتنی خەڵك مامەڵەی لەگەڵ کراوە.

لەو سەرچاوانە بیرۆکەی وا خراونەتە ڕوو, کە زۆربەیان هەر دەقی هورمزگان هەڵدەوەشێننەوە! لێرە جەخت لە سەر ئەو زمانە و ڕێنووسی ئەو زمانە دەکەین بۆ ئەوەی بسەلمێنین, کە هەندێ نووسەر و توێژەری کورد چەند بێ ئاگان هەتا لە ڕایەکانی خۆیان!!

دەقی هورمزگان، ئەگەر بە پەهلەوی نوسرابێ وەك بانگاشە دەکرێ ئەمە ئەو دەقە دەبێ هی سەردەمانی ئەشکانی بێ،نەك ساسانی، چونکە سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن, پێکچوون لە نێوان پەهلەوی ئەشکانی ٣٠٠٠پ.ز-٢٢٤ز و هەورامی، فەیلی لوری هەیە!! نەك پەهلەوی ساسانی!!

سەرچاوەکان دەڵێن پێکچوون هەیە لە نێوان زمانی پەهلەوی و شێوە زاری هەورامی،نەك هەردووك یەك بن. ئەو نووسەرە کوردانەی، لەوانە د.سەعید کوردستانی، حوسێن حوزنی موکریانی، ڕەشید یاسەمی، سەرەتا دەقەکەیان بڵاوکردۆتەوە، دەقەکەیان بە (شێوە زاری هەورامی) بڵاو کردۆتەوە, نەك بە زمانی پەهلەوی!!! هەروەها پەهلەوی هەروەك (زمان) یان (شێوە زمان variety) بووە, هەروەها (ڕێنووس)یش بووە، کەچی هەورامی تەنها شێوەزارە نەك (ڕێنووس)!! صباح قەفتانی مێژوو نووسی کورد لەلاپەڕە (١٠٥)ی کتێبی (مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ) دەربارەی "ڕێنووس"ی پەهلەوی دەنووسێ ... ئەلف و بای پەهلەوی زۆر سەخت و گران بوو، چونکە وەها دەرکەوتووە, کە لە نووسینی پەهلەوی دا هەزار پیت (حەرف) زیاتر بەکارهێنراوە!!!

هەروەها قەفتانی قسەی هەندێ زانا دەربارەی ئەلفبای پەهلەوی دەگوازێتەوە و دەڵێ: دەنگ وایە لەکاتی دوایی ساسانیەکان دا بەفەرمانی

شای ئێران شێوەی (فارس) بووەتە زمانی ڕەسمی حکومەت، چونکە نووسین و خوێندنەوەی پەهلەوی زۆر گرانبووە!!!

ئەمەش بەڵگەیە، کە هیچ نووسەرێکی کورد "دەقی هورمزگانی" بەزمانی پەهلەوی نەبینیووە!! زمانە هەورامیەکەی دەقەکە قەناعەت بەهیچ کەسێ ناهێنێت،کە زمانی کوردی سەردەمی دەرکەوتنی ئیسلام -١٦-ی کۆچی بێ لە کوردستان!! ئەو زمانە شێوەزاری هەورامی دەقەکە، هی سەرەتای سەدەی بیستەمە, نەك سەردەمی ئیسلامی، چونکە هیچ دەقێکی فارسیش ئەوها (ڕەوان) نییە!!.



# بەشی شەشەم

# شرۆڤەکردنی دەقەکە

**دەکرێ دەقی هورمزگان لەسەر سێ شەنگەست و بنەما شرۆڤە بکەین:**

- **شەنگستی زمان:**

هەرمیللەتێك بانگەشەی ئەوە بکات، کە بەشداری کردووە لە شارستانیەت civilization ئەوا دەبێ باوەڕی وابێ،کە زمانی پاك pure language تەنها ئەفسانەیە، چونکە شارستانیەتی ئێرانی، بۆ نمونە، شارستانیەتی تەنها نەتەوەیەك نیە،بەڵکو (چەند) نەتەوەیەك بەشدارن هەروەها شارستانیەت، لە (شار) بەرپا دەبێ, نەك (گوند و لادێ و ژیانی کۆچەری). لە شاردا دیاردەی فرە زمانی، گۆڕانی زمان language change دیاردەیەکی حەتمی دەبن هەروەها لەو میانەدا وەرگرتنی وشە borrowing words لە نێوان زمانەکان دا پرۆسەیەکی سروشتی دەبێت! وێڕای ئەمەش، هەر زمانێك بە چەند قۆناغێك -period– تێدەپەڕێت. زمانی کۆنی ئینگلیزی بە هیچ جۆرێ بەراورد ناکرێ بە زمانی نوێ ی ئینگلیزی،بەجۆرێ هەر دەڵێی: "دوو زمانی تەواو جودان" لەم ڕوانگە زمانییەوە نازانم چ عەقڵ و لۆژیکێك قبوڵی ئەوە دەکات،کە دەقی هورمزگان لەساڵی شانزە, یان بیست ی کۆچی نووسرابێت؟! ئەو دەقە، ئەوەندە بە زمانێکی سادە هۆنراوەتەوە، کاریگەری زمانی دەسەڵاتی فارسی، بەسەرەوە نیە!! بۆیە، لە ڕوانگەی زمانەوە، زانستی زمان قبوڵی ئەوە ناکات، کە ئەو دەقە لەسەردەمی فتوحاتی ئیسلامی

نووسرابیّ! د. جەمال نەبەز خۆیشی دەنووسێ: "بە پێی زانستی زمانەوانی دەتوانین پیشانی بدەین، کە کوردیەکەی ناتوانێ ببێتە کوردی دەوروبەری پەیدابوونی ئیسلام"!!

## • شەنگستی ئایینی:

ئەم دەقەبە مەبەستێکی "ئایینی" و "سیاسی" نووسراوە. گوتاری دەقەکە ڕەخنەگرتنە لە (ئیسلام) و (مێژووی ئیسلام): دەقەکە وا پیشان دەدات، کە موسڵمانەکان خەڵکی کوردیان لە شارەزوور و دەورووبەری کوشتووە و کچ و ژنی کوردیشیان بەدیل بردووە! هەروەها، ئیسلام وەك داگیرکەرێك وێنا دەکات!

دیاربوو شکانی ساسانیەکان لە ناوچەی فارسە نشینەکان هەتا (حەلوان) خاڵی وەرچەرخانی هەرەسی دەسەڵاتی فارسی (ساسانی) بوو لە (فارس) و ئەقلیم جبال – کوردستانی باشوری ڕۆژهەڵات –! ئەوسا نەك (شارەزوور)، بەڵکو تەواوی ئیقلیم جبال لە حاڵەتی داگیرکردن دابوو، کورد نەناسنامەی نە زمانیهەبوو! کەچی ئەو دەقە دەیەوێ شەڕی ئیسلام لەگەڵ دەسەڵاتی داگیرکەری فارس بەشەڕی (ئیسلام و کورد) ناو زەد بکات!!! دەسەڵاتی ئاگر پەرستی ساسانی وای کرد، نەك زەردەشتی هۆکار بێ بۆ ئەوەی وڵاتی فارس و بەشێك لە کوردستانی بندەستی ساسانی (بەشەڕ) یەکلایی ببێتەوە ئەگەر نا باکوری کوردستان، کە زیاتر (مەسیحی) بوون بە "سولح" و "ئاشتی" موسڵمان بوون یان وەك هاوڵاتیانی مەسیحی ناو دەوڵەتی ئیسلامی مانەوە!

دەقی هورمزگان پڕیەتی لە (لە هەڵدژی) و (پارادۆکسی). لە دوو

نیوە دێرپییەکەمدا.

## هورمزگان رمان ئانران کوژران
## ویشان شاردەوە گەورەی گەورەکان

زۆربەی هەرە زۆری نووسەرانی کورد غەڵەت لە (هورمزگان) گەیشتوون، حوزنی موکریانی، ڕەشید یاسەمی و عەلائەدین سەجادی، هەتا نووسەرانی ئەمڕۆ هورمزگان بە (مزگەوت) و (پەرستگا) تێگەیشتوون،کەچی سدیق بۆرەکەیی دەڵێ: هورمزگان ناوی یەکێ لە شارەکانی شارەزوور بووە، بەڵام ئەو ڕایەی سدیق بۆرەکەیش تەواو لە شوێنی خۆی نیە، بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوەیە(هورمز) ناوی خودای زەردەشتیەکانە، کەواتە هۆنەری دەقەکە، شارەکە، بە "شاری خودای زەردەشتیەکان" دادەنێ، نەك مزگەوت و شارێکی جوگرافی . "گەورەی گەورەکان" لە هەندێ دەق بەتایبەتی ئەوەی جلیل عباس بە "گەورەی گاورەکاندا" هاتووە.

د. هەورامانی و د. جەمال نەبەز ewir و وا پێناسە دەکەن "ئەو ناوەیە کە لەسەرەتای ئیسلام بەو کەسانە دەوترا, کە ئیسلام نەدەبوون، پابەندی ئایینەکەی خۆیان دەبوون، کە زەردەشتی بوو هەر وەك باوەڕیان وایە, کە وشەی "گۆران" لە ئەمەوە هاتبێت. بەڵام وشەی "گاوور" بەواتای مەسیحی دێ نەك "زەردەشتی" ئەوەتا گیوی موکریانی لە فەرهەنگی کوردستان لاپەڕە (٨٠٦) دەنووسێ: گاوور! فەلە، دیان, هەژار موکریانی لە لاپەڕە (٦٨٦)ی هەنبانە بۆرینە دەنووسێ: گاوور: فەلە، خاچ پەرست, هەروەها د. شەفیق قەزاز لە فەرهەنگی (شارەزوور)، لاپەڕە (٤٦٩) دەنووسێ: (گاوور) و (گەور) بە واتای فەلە Christian دێن!!

لێکدانەوەی زەردەشتیە نوێ یەکان بۆ ئەو دوو نیوە دێڕە زۆر سەیرە, ئەوان دەڵێن پەرستگاکان ڕووخان, ئاگرەکان کوژێندرانەوە, گەورە گاورەکانی زەردەشتی خۆیان شاردەوە؟! ئەمە چ (شانازی یەکە) گەورە گەورەکانی زەردەشتی خۆیان بشارنەوە, خەڵکە ڕەش و ڕووتەکەشی لە گۆڕەپانی جەنگ لە خوێن بگەوزن: مێرد ئازا تلی وە رووی هوینا پیاوانی ئازا لە ناو خوێنە تلانەوە !!

دەکرێ ئەو دوو نیوە دێڕە، خوێندنەوەیەکی مەسیحیانەی بۆبکرێ، وەك لە پێشەوە چەند دەقێکمان هێنا, کەوا دەستەڵاتی ساسانی چۆن مەسیحیە کوردەکانی دەچەوساندەوە، هەتا چەوساندنەوەکە گەیشت بووە ڕادەی کوشتنی کۆمەڵ کوژی, کە لەمێژوودا ناسراوە بە چەوساندنەوەی چل ساڵی مەسیحیەکان: شارەکانی خودا وێرانکران، ئاگری ئیمان کوژێنرایەوە گەورەی گاورەکان –خۆیان شاردەوە!! لە دووەم نیوە دێڕی دووەمدا وشە "ئارەب" کراوەتە وشەی (عەرەب) یان (عارەب)، کەسێکی وەك حوسێن حوزنی هەر بە (عارەب) دەقەکەی نووسیوەتەوە:

زۆر کرە عارب کوردی نە خاپوور

کەچی لە ئەدەبی کۆنی کوردیدا (عەرەب) بەواتای (نامۆ و نەیارو بێگانە)، دێ نەك نەتەوەی عەرەب!! خاڵکی تری زۆر گرنگ، لە ئاینی نەتەوایەتییدا، نەتەوەکان ناوێك بۆ خوداکەیان دادەهێنن و, ئەو(خودایە) هەموو شتێ لە (لەبەرژەوەندی) ئەوان دەکاتە شوکر مستەفا لە (لە سەرچاوەکانی بیرو باوەری کوردەواری)دا باسی (یەهوە)ی خودای جولەکە ئەوها دەکات: "خودای تەورات, کەنێوی یەهوەیە و لە (تەوراتدا(٦٨٢٣) جارنێوی دووبارە بۆتەوە) تەنها خودای نەتەوەی جووە و بۆ خۆشی

خودایەکی سەت لەسەت جووە....

بەرژەوەنـدی تایبـەتی نەتـەوەی جـوو لـە ڕێیەکـەوە بـێ، دەبـێ بپارێزرێ... :لاپەڕە ١٦٥.

لـە زەردەشـتیەتدا، "ئاهورامـەزدا" ناوێکـە زەردەشـت بـۆ خوداکـەی خـۆی بـەکارهێناوە، زەردەشـتیەکان ئـەوها ڕاڤـەی "ئاهورامـەزدا" یـان کردووە: دۆستی هۆشمەند، سەروەری زانا، ئەمیری ئاگا...

جەلیل عەباس، لاپەڕە(١٥).

ئـەو (هـورمز)ەی,کـە کۆتـایی دەقەکـەدا هـاتووە, هـەر ئاهوورامـەزدای زەردەشتیە!

ئەگـەر ئـەو دەقـە قسە لەسـەر ڕەوشـی زەردەشـتیەکان بکـاو خۆیـان واتـەنی (عـەرەب) چ دکرێکـی پێکـردوون. (کـچ و ژنـی دیـل کـردوون) و (پیاوانی ئازای لێکوشتوون) و (ڕەوشتی زەردەشت) بـێ کـەس ماوەتـەوە، ئەدی نازانم

بەگوێرەی دوانیوە دێڕ: بەزێرکا، نیگا هـورمز وەهیچ کـەس: هـورمز بەهیچ کەسێك بەزەیی نەهات، بۆچی ئاهوورامەزادای خودای زەردەشتیان "بەزەیی" بەزەردەشتیەکان نەهاتەوە؟! ئەگەر ئەوانە کوژرابن، زەردەشتی بن، ئەدی بۆچی (خودا) کەیان هیچ بەزەیی پێیان نەهاتەوە؟! ئەدی بۆچی (یەهوە)ی خودای جولەکە, کوشتنی بەناحەقی فەلەستینەکان بە پێویست دەزانـێ, کەچـی خوداوەندەکـەی زەردەشـتیان لەسـەر زەردەشـتیەکان بـە جواب نایەت!!

ئەو پارا دۆسکی و هەڤدژیە لۆژیك قەبولی ناکات، یان ئەوەتە ئەوەی کـوژراون، مەسـیحیە کوردەکـانن، کـە نـامۆن بـەژیانی زەردەشـتی و مـە

جوسیەت، ئاهورا مەزدا هیچ بەزەیی پێ نایەتەوە، چونکە لە ئاینی نەتەوە لایانداوە و "خودایەکی" تریان بۆخۆیان دیاریکردووە، یان ئەوەتە، کوژراوەکان مەجوسی بوونە و لەزەردەشتیەتی ڕەسەن لایانداوە، بۆیە ئاهورا مەزادا لێیان تووڕە بووە و هیچ بەزەیی پێنە هاتونەتەوە.
هەموو ئەمانە، بەڵگەن لەسەر ئەوە, کە بونیاتی سیمانتیکی و عەقیدەیی ئەو دەقە, لە گەڵ هیچ ئاستێك یەکنا گرێتەوە!

# شەنگستی مێژوویی وەك بنەمایەك بۆ هەڵوەشاندنەوەی شیعری هورمزگان

## شەنگستی مێژوویی:

لەم دەقەدا، هەندێ شوێنی جوگرافی هاتووە، وەك هورمزگان، شارەزوور... لێرە هەوڵدەدەین گریمانەیەکی دیی کۆنی ئەم شیعرە لەڕوانگەی بنەماو شەنگستی مێژوویی شاری شارەزوورەوە هەڵبوەشێنینەوە.

شارەزوور:

شارەزوور لە مێژوویی ئیسلامیدا، بەتایبەتی عەباسی و عوسمانی، ناوێکی دیارو ناسنامەی دەرکەوتنی چەندەها ڕوناکبیری کوردیی بووە، بۆیە هەوادارانی شیعرەکە هەوڵیانداوە ئەو مێژووە ئیسلامییەی شارەزور درێژبکەنەوە بۆ قۆناغی بەرلەئیسلامی!

ئەو دیما گۆجیەتە بە عەقلێکی ئاگا لە مێژووەوە گراوە بۆ ئەوەی وێنەکە وا لەزەینی خوێنەری سادەی کورد جێگیر بکەن و، سیفەتێکی داگیرکاری بۆ پرۆسەی ڕزگاری کوردستان لە ژێر هەژموونی کەلتووری سیاسیی ساسانی دابڕێژن. لێرەدا، بەگرنگی دەزانین سەرەتا لە لە ڕامان و فۆرمی جودای وشەی شارەزوور بە گوێرەی سەرچاوەکان بدوێین.

ڕامان و فۆڕمە جوداکانی شارەزوور

وشەی (شارەزوور) لەسەرچاوە مێژووییەکاندا ناوی شارەزوور بەچەندەها شێوە هاتووە هەروەها چەندەها ڕاڤەی جیاواز بۆ وشەکە کراوە.

وەبزانم تۆفیق وەهبی پێش هەر توێژەرێکی کورد لە ڕەگ و ڕیشە و واتاکانی ناوی شارەزووری کۆڵبێتەوە. لەو ڕووەوە لە گۆڤاری (سۆمەر) ژمارە (٧)، ساڵی (١٩٦١) لاپەڕە (١٢٩-١٤٤) چەندەها ڕای جیاواز بۆ ناوی شارەزوور هێناوەتەوە, کە دەکرێ لەچەند خاڵێك کورتیان بکەینەوە:

١- (زوور)ی بڕگەی دووەم لە فارسی (رزور) بووە, بڕگەی یەکەمیش (سیا - ڕەش) بووە, وشەکە لە (دارستانی ڕەش) هاتووە.

٢- مینۆرسکی دەڵێ: وشەکە (شە - رزور) بووە واتاکەشی (دارستانی پادشایەتی) دەگەیەنێ, هەروەها لە ڕوانگەی (ئاڤێستا) وەش دوو ڕای جیاواز دەهێنینەوە بەوەی (زور), وشەیەکی ئاوێستاییە واتای (ستەم) دەگەیەنێ کەواتە (شارەزوور) (شاری ستەمە)ە هەروەها دەڵێ: شارەزوور لە (شەهر زەفەر) هاتووە و (زەفەر) واتای (هێز, چالاکی) دەگەیەنێ, هەروەها دەڵێ: (زوور) لە عەرەبی بە واتای (نزم) و (قووڵ) دێت، ئەمەش لەگەڵ سروشتی خاکناسی ناوچەکە تێکناکاتەوە!!

هەرچی مامۆستا جەمال بابانە ئەوە لە لاپەڕە (٢٣٢ هەتا ٢٣٩) چەندەها ڕای جیاواز لەسەر بنەچەو واتای وشەکە لە زمانی ئاوێستا، فارسی، عەرەبی، کوردی دەهێنینەوە.

سەرەتا ئەو "ڕا" یانە دەهێنینەوە، کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن, کە "شارەزوور" وشەیەکی لێکدراوە.

لەم بەشەدا، زۆربەی نووسەران هاوڕان لەسەر بەشی یەکەمی وشەکە (شهر - شار)، کە (شەهر) فارسی یە و واتای شار دەگەیەنێ, بەڵام لەسەر بەشی دووەمی وشەکە (زوور) هاوڕا نیین.

هەندێك ڕێنووسەکە ئەوها دەنووسن: (زۆر)، یان (زێ) (زۆل) (زل) (زمر-زەهر، ژەهر) زۆربەی ئەو شرۆڤانە بەشێك لە ڕاستیان تێدایە و

گوزارشـــت لــە سروشـــت و واقیعـــی شـــارەکە دەکـــەن، عەرەبـــەکان دوو لێکدانەوەی جیاواز لەوەی (فارسی) و (کوردی) بۆ شارەکە دەکەن. یاقوت حەمـــەوی لـــە معجـــم البلـــدان لاپـــەڕە (٣٧٤-٣٧٥) دەنووســـێ: ئـــەو شارە،(زوری کوڕی زوحاك) دایمەزراندووە، کەواتە کە دەگوترێ شهر زور – بە واتای شاری زوری کوڕی زوحاك دەگەیەنێ – دوورنیە ئەم "ڕا" یە بۆنی (عروبە)ی لێ بێ، چونکە (حەمەوی) لە ناوهێنانی چەند شارێکی کوردی، لێکدانەوەیەکی عەرەبی بۆ شارەکە دەکات, کەچی دەزانین پێش هاتنی ئیسلام هیچ عەرەبێك لە شارەزوور نەبووە!!

هەروەها "ڕا"یەکی دی عەرەبی هەیە،کە شارەزوور لە "شهر زەوار" – شاری کاروانچی" هاتبێ لەم بارەیەوە، جەمال بابان، شیعرێکی مەولەوی دەهێنێتەوە!

دەنگ زەیلەی زەنگ زەواری مەیۆ

دەنگی قافڵەکەی جەهاری مەیۆ

"ڕا"ی تـریش هەیـە، کـە وشـەی (زور) (زۆر)، کـویر-قـوول" هـەتا "زەوڕەق" بێ!

## وشەی "شارەزوور" لەسەردەمی دەقی هورمزگان

لــە واتـــای کــوردی "بـــەریتانی" و "ئـــەمریکی" و "کامبریـــدج" و چەندانی تر گەڕام وشەی شەهرەزوور، شارەزوورم نەدۆزیەوە. هەروەها د. هەورامانی لە "مێژووی جوگرافیای کوردستان لە ئاڤێستادا" باسی زۆر شوێنی کردووە، بەڵام باسی "شەهرەزوور"ی نەکردووە!! ڕیچ لە لاپەڕە (١٢٠)ی گەشـــتنامەکەی بـــۆ کوردســـتان لــە ســـاڵی (١٨٢٠) دەنووســـێ: "کوردەکان تێکڕا پێ لەسـەر ئـەوە دادەگرن، کە لە کۆندا شارێك نەبووە

ناوی "شارەزوور" بووبێ. سوریشن لەسەر ئەوەی ئەم ناوانەی ئێستاش وەك زانراوە، هەر ناوچەکە بووە."!!

مینۆرسکی و ئەمین نەقشبەندی و جەمال بابان باس لەو ناوانە دەکەن کە لە کۆندا ناوی شارەزوور بوونە. ڤلادمیر مینۆرسکی لە "لە بنچینەکانی کورد و وتارێکی کوردناسی، وەرگێڕانی د.نەجاتی عەبدوڵلا، لاپەڕە (١٢٥) هەتا (١٣٣) باس لە (شارەزوور) دەکات. لە لاپەڕە (١٢٧) دەنووسێ: شارەزوور (بەشێوەکی وردتر "دوزدات") لە چەند ئەفسانەی تەوراتیدا بە(ساول تاوت) یان(ساول داود) ناوی هاتووە. هەروەها مینۆرسکی باوەڕی وابووە، کە شارەزوور لە سەردەمی ساسانیەکاندا بەناوی رنیم شەز ڕای _نیمڕاه"_ نیوەی ڕێگەی نێوان تەیسەفۆن و ئاتەشگای شیز" هاتووە. ئەو ڕایە زۆرێکیتر جەختیان لەسەر کردۆتەوە. هەر لەو کتێبەدا لاپەرە(١٢٩) مینۆرسکی دەنووسێ: شارەزوور لەمێژووی کەلیسای نەستروپەکاندا بە بەشێکی دێرەیی Dioreseیا گەرمای Badjarmak ناو نراوە. هەروەها لەسەر چاوە ئاشوریەکاندا ناوی شاری(دور ئاشور) هاتووە، هەندێ دەڵێن: ئەو شارە ئاشورییە گۆڕانی بەسەر داهاتووە و بووە بە شارەزوور! کەمال نوری مەعروف لە لاپەڕە(٢٤٧)ی کتێبی" هەندێك شوێنەواری دێرین بەر لە مێژوو مێژووی کوردستان" دەنووسێ: ناوی شارەزوور، یان شارەهرەزور، کە بەسەر دەشتەکە دا وتراوە، لەوە دەچێت بۆ دوای فەرمانڕوایەتی ساسانیەکان بگەڕێتەوە، بەڵگەش بۆ ئەمە هەتا سەردەمی ساسانیەکان

بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان ئەو ناوە نەبیستراوە یان لە ناو ڕووداوەکاندا نەهاتووە، بەڵکو هەر بە (نیم ئەزرا)_ نیوەی ڕێگا ناسراوە".

لەمانە دەردەکەوێ، کەناوی شارەزوور لە چەند زمانێك هاتبێ بەهیچ

کلۆجێك پەیوەندی بەسەردەمی ئیسلامیەوە نییە، ئەو ناچە یەش لە سەردەمی ئیسلامیدا ناوی (شارەزوور) نەبووە هەروەها ئەم ناوە لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا لە زمانی پەهلەوی و شێوە زاری هەورامیدانەبووە، بەڵکوی ناوەکە زۆر هی دوایی ئەو قۆناغە مێژووییە. هەروەك وتمان، شارەزوور لە سەردەمی ئیسلامی: عەباسی، ئەیوبی، عوسمانی بۆتە ناوچەیەکی ناسراو لە جیهانی ئیسلامیدا، هەتا چەندەها زاناو فەقیە و شەرعزان لەو سەردەمە, سەدەی دوازدە و سێزدە(نەك سەدەی حەوت!!) هەڵکەوتوون و بوونەتە ناوی دیار لە مێژووی ئیسلام دا.

هەروەها لەسەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا، شەهرەزوو یەکێك بووە لەو سێ لیوایەی ویلایەتی موسڵ، لەمەش زیاتر، شەمسەدین سامی لە قاموسی ئەعلا میدا, کە ئەحمەد تاقانە لە تورکیەوە وەری گێڕاوە بەناوی "کورد و کوردستان لەیەکەم ئەنسکلۆپیدیای تورکی لە مێژوو دا" لە لاپەڕە (٢١٦)دەنووسێ:" لیوای شارەزوور کراوەتە ٦ قەزاو ٨ ناحیە, قەزاکانی ئەوسا ئەمانە بوون: کەرکوك، هەولێر، ڕانیە، ڕواندز، سەلاحیە (کفری) و کۆیە (کۆیسنجەق). بەکورتی لەسەردەمی عەباسی و عوسمانیش، شارەزوور ناوێك نەبووە بۆ "شار"ێك، بەڵکو هەرێمێکی فروانبووە, کە نزیکەی زۆربەی باشوری کوردستانی گرتۆتەوە.

لە مێژووی شاری شارەزووریش دەگەینە ئەو ڕاستیەی, کە شیعری هورمزگان شعرێکی ساختەیە، چونکە هەروەك چۆن زمانی دەقەکە نوێ یە، هەروەها زۆر بەهەڵە دەقەکە لە ڕووی ئایینیەوە لێکدراوەتەوە, هەروەها ئەوسا، لە ساڵی ١٦-٢٢ی کۆچی، شارەزوور چ وەك وشە, چ وەك ناوی شارێك لە هیچ دەقێکدا نەبووە!!!

# فەرهەنگۆك

پێدڤیە: پێویستە

شیان: توانا

مژۆڵ: سەرقاڵ

تژی: پڕ

دۆنادۆن: تناسخ الارواح

کەلکەلە: ئارەزوو، خولیا، واهیمە

جیۆپۆلۆتیك: جوگرافیای سیاسی

ئارێشە: کێشە

شرۆڤە: راڤە

میتۆد: ڕێباز

ئەمبیگوتی: لێڵ- زیاتر لە واتەیەك

زۆم: دەوارنشین/ کۆچەر

ئەتنیکی: رەگەزی (نەتەوەیی)

زێد: نیشتمان، حەوانگە

ریفۆرم: چاککاری

ئۆردۆ: لەشکر

تەناهی: سەقامگیری

گاڤ: کات

کرێت: ناشیرین

شەنگستە: بنەما

هۆڤانیەت: وەحشیەت/ وەحشیگەری

ئۆردوخانە: لەشکرگە

دەوار: ڕەشماڵ، چادر

ژێدەر: سەرچاوە

راژە: خزمەت

مەتەرێز: سەنگەر

ئەلتەرناتیف: بەدیل- جێگرەوە

درب: زەبر

چەپەر: سوپەر

## سەرچاوەکان:


١- جمال بابان: سلێمانی شارە گەورەکەم، سلێمانی لە ڕۆژی بنیاتنانیەوە تا کۆتایی دەسەڵاتی بابانەکان، سلێمانی، ١٩٩٩، بەرگی یەکەم.

٢- ئەیوب ڕۆستەم: هەورامان، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی کولتوریە، سلێمانی، ٢٠٠٨، چ٢.

٣- جمال بابان، اسماء المدن والمواقع العراقیە، بغداد، ١٩٧٦م.

٤- ئەحمەد شەریف علی، ئەنفال لە ڕۆمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆیە، ٢٠٠٩.

٥- علاوالدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بغداد، ١٩٥٢.

٦- کوردستان موکریانی، زار کرمانجی، هەولێر، ٢٠٠٢.

٧- حای -م- رەسوڵی و کادی ە- ئیلین، پزیشکێك لە کوردستانەوە، هەولێر، ٢٠٠٣.

٨- جەمال نەبەز: زمانی یەکگرتووی کوردی، ئەڵمانیا، ١٩٧٦.

١٠- محەمەد ئەمین هەورامانی، زاری زمانی کوردی لە تەرازووی بەراووردا، بغداد، ١٩٨١.

١١- زبیر بیلال اسماعیل، مێژووی زمانی کوردی، و. یوسف رۆوف علی، بەغدا، ١٩٨٤.

١٢- کۆمەڵە نووسەرێك، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، بەغداد، ١٩٨٣.

١٣- مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، هەولێر، ٢٠٠١.

١٤- کوردستان موکریانی، رووناکی، هەولێر، ٢٠٠١.

١٥- جەلیل عەباس، ئاڤێستا، گاتا-کات، هەولێر، ٢٠٠٣.

١٦- ڕەشاد میران، ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستان، کوردستان، ٢٠٠٠.

١٧- شوکر مستەفا، سەرچاوەکانی بیروباوەڕی کوردەواری، هەولێر، ٢٠٠٦.

١٨- کەمال نوری، هەندێك شوێنەواری دێرین...، سلێمانی، ٢٠١٠.

١٩-خەسرۆ گۆران، کوردستان لە مێژوودا، چاخە کۆنەکان (١٠٠٠ هەزار ساڵ پ.ز- ٤٠٠ی زایین، بەشی یەکەم، وەرگێڕانی ئاسۆ کریم، (هەولێر:٢٠٠١)
٢٠-حەسەن محمود حمە کریم، ئاینی کورد، لە تۆفانی ئیسلامی دا، چاپی سێیەم. (سلێمانی ١٩٩٧)
٢١-کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا، چاپی سێیەم، (سلێمانی:٢٠٠٢).
٢٢-شوان عوسمان مستەفا، کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد، (سلێمانی: ٢٠٠٢)
٢٣- سەلام ناوخۆش، سێکوچکەی هەرەس، (هەولێر: ١٩٩٩)
٢٤-سەرکیس ئاغاجان، کوردە مەسیحیەکان لەسەر دەمی ساسانیدا، هەولێر ١٩٩٦
٢٥-شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی هەژار موکریانی،(نەجەف:١٩٧٢)
٢٦-موحەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، چاپی نوێ، (سلێمانی ٢٠٠٠)
٢٧-مەلا جەمیل رۆژبەیانی، ولاتگیری رەشەخاکی عێراق، (سلێمانی:١٩٩٧)
٢٨-مەلا رەئوف سەلیم حەویزی، کوردستان و ئاینی ئیسلام، (جامعە: ١٩٧٠)
٢٩-شاسوار خ‌هەرشەمی، مێژووی ئارامیەکان لە کوردستاندا، (سلێمانی:١٩٩٩)

**ماستەرنامە و دکتۆرانامەکان:**

١-احمد میزا میزا، غربی الجبال فی صدر الاسلام، رساله ماجستیر غیر منشوره، کلیه الاداب، جامعه صلاح الدین اربیل ١٩٩٤.
٢-ئاکۆ عبدالکریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢، ماستەرنامە کۆلێژی

زانسته مرۆچایەتییەکان زانکۆی سلێمانی ٢٠٠٢

٣-فائزه محمد عزت، الكرد في اقليم الجزيره و شهرزور في صدر الاسلام ١٦ه ١٣٢ه/٦٣٧-٧٤٩م، رساله ماجستير غير منشوره، كليه الاداب، جامعه صلاح الدين ١٩٩٢.

٤-فرست مرعى اسماعيل، الكرد مصادر و معالم تاريخهم في صدر الاسلام مرحلة الفتوحات، ١٦ه-٢١ه، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب جامعة الخرطوم ١٩٩٧.

٥-الامارات الاسلامية في بلاد الكرد في العصر العباسي الثاني ٣٥٠-٥١١ه رسالة دكتورا غير منشورة كلية الاداب جامعة صفاء ٢٠٠٠ .

٦-حسام الدين على غالب، الكرد في الدينور و شهرزور رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٧٥.

٧-كلثومة جميل عبدالواحيد، الحياة الدينية و الاجتماعية و الاقتصادية لبلاد الكرد في عهد الساسانيين (٢٢٤-٦٣٠)م، كلية الاداب جامعة صلاح الدين-اربيل ٢٠٠٢

## گۆڤار و رۆژنامەکان:

١-زرار سديق، تاريخ ظهور تسمية كوردستان، گۆڤاری مەتین، ژ (٨٠).

٢-سەلام، ئایا راستە ئیسلام کوردستانی داگیرکردووە؟! گۆڤاری ئیسلام ژ(٢-٣) (هەولێر ١٩٩٣)

٣-ئارام عبدالسلام، رەوشی کورد پێش ئیسلام، رۆژنامەی دەنگی غەریبان ژمارە (١) (لەندەن: ٢٠٠٢)

٤-فوئاد رەشید، ئامادەبوونی ناونیشان لە پرۆسەی نووسیندا، ڕامان، ژ(٦٨) ٢٠٠٢

٥-موعتەسەم نەجمەدین، خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی: کوردستان و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد، رۆژنامەی هەواڵ، ژ(٣٣) (سلێمانی:٢٠٠٢).

**سەرچاوە عەرەبیەکان:**


١-القرآن الكريم.

٢-الانجيل كتاب الحياة، (بيروت/١٩٨٢)

٣-ابن الاثير، الكامل في التاريخ، دار الفكر، (بيروت:١٩٧٨)

٤-الاصطخري، المسالك و الممالك، دار العلم، (سوريا:١٩٦١)

٥-البلاذري، فتوح البلدان، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٧٨)

٦-ابن حوقل، صورة الارض، مكتبة الحياة، (بيروت:١٩٧٩)

٧-الطبري، تاريخ الامم و الملوك، منشورات مؤسسة الاعلمي للمطبوعات(بيروت:١٩٩٨)

٨-ابوالفداء، كتاب تقويم البلدان، دار الطباعة السلطانية، (پارس١٨٥٠)

٩-ابن الفقيه، مختصر كتاب البلدان، دار احياء التراث العربي، (بيروت:١٩٨٨)

١٠-قدامة بن جعفر، الخراج و الصناعة الكتابة،(بغداد ١٩٧٩)

١١-ابن كثير، البداية و النهاية، دار احياء التراث العربي (بيروت: ١٩٩٧)

١٢-المقدسي، احسن التقاسيم، دار احياء التراث العربي (بيروت:١٩٨٧)

١٣-ياقوت الحموي، معجم البلدان، دار صادر، (بيروت: ١٩٧٧)

١٤-بروكلمان، كارل، تاريخ الشعوب الاسلامية، دار العلم، (بيروت:١٩٨١)

١٢-كمال أحمد عادل، الطريق إلى المدائن، دار النفائس، (بيروت:١٩٧٢).

١٦- سقوط المدائن و نهاية الدولة الساسانية، دار النفائس، (بيروت:١٩٨١).

١٧-محب الله ن، موقع الاكراد و كردستان تاريخيا و جغرافيا و حضاريا، (١٩٩١)

١٨- مصطفى، عبدالله، امجاد الاكراد، (اربيل:٢٠٠٢)

١٩-هاجانى، حازم، صفحات من تاريخ الكرد و كردستان، (اربيل:٢٠٠٢)

# پێـــڕســـت



پ. ی. سەلام ناوخۆش

## ژیاننامەی زانستی
## پرۆفیسۆری یاریدەدەر سەلام ناوخۆش

**یەکەم: ژیاننامە**

لەساڵی ١٩٦٦ لەدێی زێباروک لەدایکبووە، لەساڵی ١٩٦٩ەوە هاتوونەتە هەولێر. خوێندنی سەرەتایی لە ١-٣ لە سەرەتایی "زاگرۆس" و لە ٤-٦ لە سەرەتایی "مەولەوی" تەواو کردووە. قۆناغی ناوەندی لە "قوتەیبە" تەواو کردووە، ئامادەیی لە هەڵمەتی کوڕان تەواو کردووە. لەساڵی ١٩٩٠ بەشی ئینگلیزی لە ئادابی زانکۆی سەلاحەددین وەرگرتووە، لەساڵی ١٩٩٦ لەهەمان بەش ماستەری تەواو کردووە. لەساڵی ١٩٩٦ هەتا کۆتایی ٢٠٠٣ لە بەشی ئینگلیزی ئادابی دهۆک مامۆستا بووە. لە ٢٠٠٤ هەتا ئێستا مامۆستایە لەبەشی ئینگلیزی پەروەردەی بنیاتی زانکۆی سەلاحەددین.

**دووەم: نازناوی زانستی**

- لە ٢٠/٦/١٩٩٦ مامۆستای یاریدەدەر.

- لە ٢٠/١/١٩٩٩ مامۆستا.

- لە ٢٠/٣/٢٠٠٧ پرۆفیسۆری یاریدەدەر.

**سێیەم: چالاکییە ئەکادیمییەکانی**

- لەساڵی ١٩٩٨ بە توێژینەوەیەك بەشداری لە یەکەم کۆنفرانسی زانکۆی دهۆك کرد.

- لەساڵی ١٩٩٩ بەتوێژینەوەیەك بەشداریی لە یەکەم کۆنفرانسی زانستی زانکۆی سلێمانی کرد.

- لەساڵی ٢٠٠٠ بەشداریی لە یەکەم کۆنفرانسی خوێندنی باڵای زانکۆکانی هەرێم کرد.

- لەساڵی ٢٠٠٥ بەتوێژینەوەیەك بەشداریی لە کۆنفرانسی زمان کرد.

**چوارەم : توێژینەوە ئەکادیمییەکانی:**

1- sequence of Descriptive adiecfives in kurdish

گۆڤاری ئوستاد- زانکۆی بەغدا

2- A confrasfive study of Ellipsis in kurdish aud english

گۆڤاری زانکۆی دهۆك

3- Kirmanji kinship terms

گۆڤاری زانکۆی دهۆك

4- polysemy ofsome adiecfives in Kurdish

گۆڤاری دهۆك

5- Kurdish Honorifics system

گۆڤاری زانكۆ- سەلاحەدین

6- Ambiguity in Kurdish

گۆڤاری زمان- كۆلێژی زمان

7- Kurdish Diminufive system

گۆڤاری زانكۆی دهۆك

8- Diglossia in Kurdish

گۆڤاری ئوستاد- بەغدا

9- classifying and translating idioms

گۆڤاری زانكۆی دهۆك

**پێنجەم: كتێبەكانی**

ا- فەرهەنگ نووسین

١- فەرهەنگی ئۆكسفۆرد ئینگلیزی- كوردی .

٢- فەرهەنگی ئۆكسفۆردی نوێ - سۆرانی- بادینی- ئینگلیزی .

٣- فەرهەنگی سیدرا، كوردی-عەرەبی- ئینگلیزی.

٤- فەرهەنگی هیوا، ئینگلیزی- كوردی.

٥- فەرهەنگی هەراشان- "بەهاوبەش" .

٦- فەرهەنگی زاراوەی لەشكری،"بەهاوبەش".

٧- فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی،"بەهاوبەش" .

**ب:زمانناسی**

١- زمانناسی و هەندێ بابەتی زمانناسی کوردی .

٢- پوختەیەك دەربارەی زمانناسی .

٣-ئایین و زمانناسی .

٤- واتاسازی"بەهاوبەشی لەگەڵ م.نەریمان".

٥- یاسا بنەڕەتییەکانیڕستەی کوردی،ماستەرنامەکەی پرۆفیسۆر وریا عومەر ئەمین .

٦- سارا، بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی.

**جـ: وەرگێران**

١- قورئان و زانستی نوێ- لەئینگلیزییەوە.

٢- کوردو کوردستان لەنێوان بەرداشی داگیرکاران- لەئینگلیزییەوە.

٣- کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی ویلایەتی موسڵ- لەئینگلیزییەوە.

٤- یاسا بنەڕەتییەکان- لەئینگلیزییەوە .

٥- نۆ چیرۆك لەبارەی خەڵکەوە- لەئینگلیزییەوە .

هـ: مێژووی سیاسی/ نووسین

١- کوردستان چۆن داگیرکراو دابەشکرا .

٢- هۆکارەکانی رکاندنی ویلایەتی موسڵ .

٣- سێکوچکەی هەرەس .

٤- مافی مێژووی غەیرە کورد بەسەر کوردستانەوە .

٥- ململانێی ئینگلیزو تورك .

٦- شێخ مەحموود و سێ ئەفسەرەکە .

٧- ئاین و ناسیۆنالیزم .

ح: ئەو کتێبانەی بەنازناو بڵاوی کردوونەتەوە:

١- دراسة عن احتلال و تقسيم كردستان، ترجمة- يوسف كمال.

٢- دۆزی کورد لەنێوان بەرداشی مارکسیەت و دیموکراسیەت - هیوا ئەمین .

٣- لۆزانی ١٩٢٣ و لۆزانی ١٩٩٠- محەمەد سەلام.

٤- کورد لەنێوان ئیسلام بوون و ئیسلام کرندا- هیوا سەلام .

٥- عەلمانیەتی مارکسی و دیموکراسی- دلشاد عوسمان.

د-کتێبی ئەدەبی:

١- رەخنەو رۆمان و رۆژنامەگەریی ئیسلامی .

شەشەم: هەندێ لە وتارەکانی

١- دوو وێنەی ئەڤینی لە رۆمانەکانی هەمنگوای- ر. هاوکاری، ١٩٩١.

٢- بانقی حیسابم- چیرۆك- وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە. ر. پاشکۆی عێراق، ١٩٩٠.

٣- بێ بار چیرۆك- وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ر. هاوکاری، ١٩٩٠.

٤- هەموو رێگاکان بەرەو گەرماوی هەولێر دەچن، لە ئینگلیزییەوە، ر. هاوکاری ١٩٩٠.

٥- پێنجەم ئافرەت لەژیانی سارتەر، لە ئینگلیزییەوە، ر. هاوکاری، ١٩٩١

٦- مردنی فەرمانبەرێك، لە ئینگلیزییەوە. ر. پاشکۆی عێراق.

٧- رەخنەی نوێ. لە ئینگلیزییەوە. گۆڤاری پەیامی راستی. ژ.٦.

٨- ڕەخنەی ئەدەبی لەسەردەمی ڕێنسانس. لە ئینگلیزییەوە، ڕ. برایەتی ١٩٩٣ .

٩- ژیانی فانتازی تۆم ستۆپارد، لە ئینگلیزییەوە، ڕ. هاوکاری ١٩٨٨ .

١٠-ڕێڤیی خاپینۆك- لە لاتینییەوە، ڕ. بزاڤ، ١٩٨٩.

١١- دامەزراندنەوەی عەقڵی کوردی.ڕ. ڕابوون ١٩٩٣ .

١٢- کوردەکانی سۆڤیەت، ڕ. برایەتی، ١٩٩٣.

١٣- مارکسیەت و دیموکراسیەت بۆ کورد -دوو ڕووی یەك شت بوون، ڕ. ڕابوون ١٩٩٥ .

١٤-فیدراڵیەتی ئیسلامی، ڕ. ڕابوون، ١٩٩٦.

١٥- خوێندنەوەیەکی سیمانینکیانەی، گ. دهۆك، ١٩٩٦ .

١٦- کارەکتەری دەربڕی، گ. گازی ١٩٩٧.

١٧- لە سیڤەرە بۆ لۆزان و حەتیمەتی دابەشکردنی کوردستان، گ. ڤەژین ١٩٩٨.

١٨- کوردستان دوای کوردستان، ڕ. برایەتی و ڕۆژنامەی یەکگرتوو. ٢٠٠٥.

١٩- الشوفينية، ج. خەبات ١٩٩٨.

٢٠- اسباب نزاع الامراء الكرد مع سلفات العثمانية.ج.خەبات ١٩٩٩.

٢١- ڕۆشنبیرو دەسەلآت، ڕ. یەکبوون ٢٠٠٠.

٢٢- ڕۆژئاواو مەسەلەی کورد، سێ ئەڵقە،ڕ. یەکگرتوو ١٩٩٤.

٢٣- هەرەف تۆفیەت و تاك سیستەمی ئەمریكا، سێ ئەڵقە،ز.رابوون ١٩٩٣.

٢٤- بیبلۆگرافیای رۆژنامەگەری ئیسلامی كوردی،گ. جەماوەر ٢٠٠٠، ژ ٧٦-٧٧.

٢٥- رۆمانی ئینگلیزی،ڕ. پەیمان ١٩٩٩ .

٢٦- سۆرمانجی، ڕ. پەیمان ١٩٩٩ .

٢٧- پوختەیەك دەربارەی پراگماتیكس، ڕ. پەیمان ١٩٩٩.

٢٨- مافی مێژوویی ئەرمەن و ئاشووری لەكوردستان، ڕ. پەیمان ١٩٩٩.

٢٩- مێجەر نوئیل و مەسەلەی كورد، گ. دهۆك، ١٩٩٩.

٣٠- مێجەر سۆن و مەسەلەی كورد، گ. دهۆك، ١٩٩٩.

٣١- ئۆزدەمیر و مەسەلەی كورد، گ. دهۆك، ١٩٩٩ .

٣٢- رۆژهەڵاتناس و دەسەڵات، گ. گازی ١٩٩٨ .

٣٣- نانی رووتم خوێندەوەو نەشكریام،ڕ. بەدرخان ٢٠٠٧ .

٣٤- ماستەر نامەكەی وریا عومەر ئەمین، ڕ. بەدرخان ٢٠٠٧.

٣٥- زمانی كوردی زمانێكی مۆرفیمی نییە، گ. كاروان ٢٠٠٦ .

٣٦- ١+١=١، گ. گوڵان ٢٠٠٦.

٣٧- چوارچێوەی ئاخاوتن، گ.نەوشەفەق ٢٠٠٥.

٣٨- هەڵوەشاندنەوەی سیڤەر،گ. سەنتەری برایەتی ١٩٩٩ .

٣٩- بزاڤی دەستەخوازی توركیا، گ. سەنتەری برایەتی ١٩٩٨ .

٤٠-شیعری جەنگ لەشیعری ئینگلیزیدا، ڕ. برایەتی ١٩٩٣ .

٤١- كرۆنۆلۆژیای مەسەلەی کورد، ڕ. برایەتی ١٩٩٨ .

٤٢- سایکس بیکۆ، گ. ستاندەر ٢٠٠٧ .

٤٣- سێکوچکەی ستەم- وەلاّم، گ. ستاندەر ٢٠٠٧.

٤٤- پەیمانی قامیرە، گ. دهۆك ١٩٩٩.

٤٥-شێخ سەعیدی پیران، گ. ڤەژین ١٩٩٩.

٤٦-فەتواکەی مەلای خەتیّ، گ. مەتین ١٩٩٩.

٤٧- هەولێر و ئەربائیلۆ، گ. هەولێر١٩٩٩.

٤٨- هاوپەیمانی نویّ، ڕ. کوردستان راپۆرت ٢٠٠٧.

٤٩- شارچییەتی، ڕ. کوردستان راپۆرت ٢٠٠٧.

٥٠- سونەچین و کێن، ڕ. میدیا٢٠٠٧.

٥١- رۆژئاواناسی...ڕ.ئاوێنە ٢٠٠٧.

٥٢-فیدراڵیەکی تر، ڕ. پرس ٢٠٠٧.

٥٣- مەغزاو جۆرەکانی، ڕ. نویّ٢٠٠٧.

٥٤- کارەکتەری سەرەکی، ڕ. نویّ ٢٠٠٧ .

٥٥- عەقڵی ئیمانی، گ. پەیامی راستی ٢٠٠٦.

٥٦- زمان و ئاسایشی مەعریفی، گ. زانکۆی نویّ ٢٠٠٧.

٥٧- عەقڵی میلیشیایی، ڕ. میدیا ٢٠٠٧.

٥٨- سێکوچکەی ستەم، گ. ستاندەر ٢٠٠٧.

٥٩- جووتە وشە، گ. پێشکەوتن٢٠٠٧.

٦٠- هاوپەیمانی ئیسرائیل، ڕ. کوردستان راپۆرت٢٠٠٧.

٦١- نەوەی نوێ و تەلاق، ڕ. یەککگرتوو ٢٠٠٧.

٦٢- میلیشیایی لە بلاوکردنەوە، گ. رامان٢٠٠٧ .

٦٣- قوتابخانەی پراگی زمانەوانی، گ. رامان ٢٠٠٦ .

٦٤- ڕۆڵـی مـۆرفیمی"ێ"لـە کورتکردنـەوەی رسـتەدا، گ. زانکـۆی دهـۆك ٢٠٠٠.

٦٥- ئیسلام یان عەرەبایەتی، ڕ. رابوون ١٩٩٣ .

٦٦- ململانێی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات، گ. مەتین ١٩٩٦ .

٦٧- تەبایی داگیرکاران، گ. مەتین ١٩٩٦ .

٦٨- ململانێی سەرانی کورد، گ. مەتین ١٩٩٦ .

٦٩- سوێندخۆرەکان و کورد، ڕ. برایەتی ١٩٩٣.

٧٠-دادایزم یا ولآخیزم، ڕ. رەسەن ١٩٩٧ .

٧١-دانیـال دیفـۆ بـاوکی ڕۆمـانی ئینگلیـزی، ڕ. برایـەتی، ئـەدەب و هونـەر ١٩٩٨.

٧٢- هێزی فیلدینگ و هونەری ڕۆماننووسین، ڕ. برایـەتی، ئەدەب و هونـەر ١٩٩٨.

٧٣-خوێندنەوەیـەك بـۆ هەنـدێ لـە ڕۆمانـەکانی نـەوال سـەعداوی،گ. گـازی ١٩٩٨.

٧٤- رەوشــی کوردســتان لەســەردەمی ساســانییەکان، ب. دەنگــی غــەریبان ٢٠٠٢.

٧٥- دەوڵــەتی ئیــسلامی یــان دەوڵــەتی موســڵمانیش، ب. دەنگــی غــەریبان ٢٠٠٢.

٧٦- خوێندنەوەیەکی مەعریفی مێژوو، پ. رابوون ١٩٩٣ .

٧٧- شیعری"خۆشم دەوێی"، پ. پاشکۆی عێراق ١٩٨٧ .

٧٨- شیعری"کە ئێوارەدێت"، پ. هاوکاری ١٩٨٨.

٧٩- شیعری"رۆژانی ئاسوودەیم"، پ. پاشکۆی عێراق ١٩٨٩.


<u>حەوتەم:چاوپێکەوتنەکانی</u>


١- گۆڤاری کاروان .

٢- گۆڤاری پەیامی راستی .

٣- گۆڤاری زانکۆی نوێ.

٤- گۆڤاری ستاندەر .

٥- گۆڤاری ئەمریکاناسی .

٦- رۆژنامەی جەماوەر .

٧- رۆژنامەی نوێ .

٨- رۆژنامەی وەرچەرخان .

٩- رۆژنامەی سۆلیدارێتی.

١٠- رۆژنامەی خەباتی نوێ .

١١- رۆژنامەی ئاڵای ئازادی.

١٢- گۆڤاری گازی .

١٣- رۆژنامەی کۆمەڵ .

١٤- رۆژنامەی هەولێر پۆست .

١٥- رۆژنامەی رەسەن .

## تەلەڤزیۆن و رادیۆکان:

١٦- تەلەڤزیۆنی سەتەلایتی کوردستان.

١٧- تەلەڤزیۆنی CBSی ئەمریکی .

١٨- تەلەڤزیۆنی کەناڵی دهۆك .

١٩- تەلەڤزیۆنی هەولێری یەکێتی .

٢٠- تەلەڤزیۆنی کۆمەڵ- کەناڵی هەولێر .

٢١- رادیۆی زانکۆ .

٢٢- تەلەڤزیۆنی سەحەری ئێرانی .

٢٣- سەتەلایتی رۆژ تیڤی .

## هەشتەم: ئەوکتێبانەی پێشەکی بۆ نووسیون

١- نەوال سەعداوی و ئایدۆلۆژیای رق نووسین، محەمەد یوسف١٩٩٥ .

٢- کێشەی ئەدەب و سیاسەت لە وڵاتە سۆشیالیستەکان،وەرگێڕانی محەمەد یوسف ١٩٩٩.

٣- رۆژئاواییەکان بۆ موسڵمان دەبن؟، وەرگێڕانی ئەلسرومە جەمیل ٢٠٠٧.

٤- بووکە بەبارانێ، کۆمەڵە شیعری،ئارام شارباژێڕی ٢٠٠٧ .

٥- فەرهەنگی کۆمەڵناسی، م. عوبێد ٢٠٠٧ .

٦- کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ .

٧- قورئان و زانستی نوێ .

٨- کوردەکان و کوردستان.

مێژوونووس ( ئارنۆڵد توینبی ) لە بەشی دووەمی کتێبی (مێژووی بەشەرییەت) دەنوسێ : بەڕاستی سوپای ئیسلام چاکتربوو لە سوپای فارس و ڕۆم .. هەرگیز لە جەنگدا دڕندە نەبوو ئەمەش خاڵێکی دیبوو کە کورد لە زۆر شوێن بەبێ شەر موسڵمان ببن .

تۆماس ئارنۆڵد دەڵێت: مەحاڵە بگوترێت موسڵمانەکان لە گرتنی ناوچەکانی وڵاتی ساسانی هێزیان بە کارهێنابێت لە پێناو سەپاندنی ئایینی ئیسلام بە سەر دانیشتوانی ناوچەکە.

کورد بەر لە ئیسلام زەردەشتی، فەلە،یاخود بەشێک جولەکە بوونە، کەئەمە وایکردووە لە عەرەبە بت پەرستەکان زوتر ئیسلام قبوڵ بکەن .

لە شەرەفنامەدا هاتووە : هەرچی دەڤەری جەزیرەیە کۆمەڵێک کوردی بازرگان لە هۆزی "باجن" لە جزیرەی بۆتانەوە چونەتەتائیف و لە سەردەستی پێغەمبەر موسڵمان بوون، کە ژمارەیان نۆ کەس بووە ، دواتر هەموو کورد لەسەر دەستی ئەم نۆ کەسە موسڵمان بوون.


نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com




